# دوایین رازەکانی ژیان

## گوێڕایەڵی دڵتان بن



ئەم کتێبە ٢١ جار لەچاپ دراوە

نووسینی: ئەندرۆ متیۆس
وەرگێڕانی: کارۆ شێخ

چاپی دووەم
2011

2010/1/22

# دوابین رازەکانی ژیان

## گوێڕایەڵی دڵتان بن

نووسەر: ئەندرۆ متیوس
وەرگێرانی: کارۆ شێخ

چاپی دووەم
٢٠١١

Scanned by CamScanner

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە: (١٠٥)

- ناوی کتێب: دوایین رازەکانی ژیان
- بابەت: دەروونزانی
- نووسەر: ئەندرۆ متیۆس
- وەرگێڕ: کارۆ شێخ
- دیزاین و مۆنتاژ: وەرگێڕ
- نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١١
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەسپاردنی: (        )ی ساڵی (٢٠١١) ی پێدراوە.

ناونیشان: سلێمانی ــ بازاڕی سلێمانی ــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣), (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)





پێشکەشە بە: ئازیزانم

دلێر، سۆران، ئەسرین و ئاسۆ

# پێرست

## بەشی یەکەم



## بەشی دووهەم



## بەشی سێهەم

## بەشی چوارەم

ئەوکاتەی کە لە رادەبەدەر هەڵواسراو دەبن، هەموو شتێك وێران دەکەن!



## بەشی پێنجەم

بیر لە هەرچی بکەنەوە بەرینی دەکەن



## بەشی شەشەم

گوێڕایەڵی دڵتان بن

## بەشی حەوتەم



## بەشی هەشتەم



## بەشی نۆهەم

## بەشی دەیەم

راسپاردەی تۆ گۆڕانی جیهان نییە، تۆ راسپێردراوی بۆ گۆڕینی ژیانی خۆت.

# بەشی یەکەم

## بۆچی پێویستمان بە کارەسات هەیە؟

## وانەکانی ژیان

## ژیان کردن و فێربوون

### لەوانەیە بەرچاوترین شتەکان نەبینین؟

کاتێ کە تەمەنم دە ساڵان بوو بەنرخترین سەرمایەی ژیانم تۆپی فتبۆڵەکەم بوو. لەگەڵی خواردنم دەخوارد، دەنووستم و تەنانەت حەوتووی جارێك بۆیاخم دەکرد.... لەجێی پێلاوەکانم! زانیاری من سەبارەت بە فتبۆڵ زۆرچاك بوو، بەلاّم لەزۆربەی مەسەلەکاندا ئەوەندە بەئاگا نەبووم، بۆنموونە، شتێکم سەبارەت بە لەدایکبوونی منداڵ نەدەزانی. پاش نیوەڕۆی ڕۆژێك لە شەقام دا خەریکی یاری کردن بووم کە تۆپە نازدارەکەم ون بوو. هەموو شوێنێك گەڕام بەدوویدا و دواجار گەشتمە ئەو ئەنجامەی کە بێگومان کەسێك تۆپەکەمی دزیوە. دوای گەڕانێکی زۆر کەوتمە شوێن خانمێك کە واهەستم دەکرد کە لەژێر جلوبەرگەکەیەوە شاردویەتەوە. بەهەڵاتن دوای کەوتم و پێم وت: "خانم! بۆچی تۆپەکەی منت لە ژێر جلەکانتەوە شاردوەتەوە؟" وە دواجار بۆم دەرکەوت کە تۆپێك لە ئارادا نییە، بەلاّم لانیکەم لەو پاش

نێوەڕۆیەدا زانیم کە منداڵ چۆن لەدایك دەبێت و شێوەی ئەو ژنانەی سکپڕن چۆنە؟ وە هەڵبەت دوای چەند خولەکێك تۆپە ونبووەکەم دۆزرایەوە، بەڵام لەهەمووی سەیرتر لای من ئەوە بوو کە تا ئەو رۆژە، قەد سەرنجم نەداوەتە ژنانی سکپڕ و بۆچی لەو رۆژە بەدواوە، خۆم لە گەمارۆی ژنە دوگیانەکاندا دەبینیەوە؟

## کورتەی وتە

کاتێك زانیاری نوێمان دەست دەکەوێت کە ئامادەیی پێویستمان بۆ وەرگرتنی هەبێت. وە تا ئەو کاتە، تەنانەت بەرچاوترین شتەکان لە بەرچاوی ئێمەدا شاراوەیە.

## بۆچی پێویستمان بە کارەسات هەیە؟

بۆچی زۆربەی ئێمەی مرۆڤ تاکاتێ کە گوشارمان لەسەر نەبێت هیچ شتێك فێرنابین؟ بۆ ئەوەی کە گۆڕانێك لە رەوشتی خۆماندا ئەنجام نادەین. وەك نموونە، باس لە مەسەلەی تەندروستی بکەین. ئێمە لە چ کاتێکەوە پارێز لە خواردن دەگۆڕین و دەست دەکەین بە وەرزش کردن؟ لەو کاتەوە کە دوکتۆر دەڵێت: "ئەگەر شێوازی ژیانت نەگۆڕی خۆت دەکوژی! وە ئەوکاتەیە کە لەناکاو وەئاگا دێینەوە!"

لە پەیوەندی هاوسەری دا: بەزۆری ئێمە لە چ کاتێکەوە بە هاوسەرەکانمان دەڵێین کە خۆشمان دەوێن؟ لەو کاتەدا کە شیرازەی ژیانمان لە تێکچوون دایە! لە مەکتەب دا: ئێمە چ کات تەسلیم دەبین و گرنگی ئەدەین بە وانەکانمان؟ کاتێ کە لە لێواری مانەوەداین.

لە ئیش و کاردا: لە چ کاتێکەوە بیر لە فیکرەی نوێ دەکەینەوە و بڕیاری دژوار هەڵدەبژێرین؟ لە کاتێکدا کە مایەپووچ بووین. چ کاتێك فێری خزمەت کردن بە کڕیار دەبین؟ دوای ئەوەی کە کڕیارەکانمان لەدەست دا!

بەزۆری چ کاتێك دەست دەکەین بە پاڕانەوە و دۆعا؟ کاتێك کە ژیانمان ئاڵۆزاوە و تووشی کێشە بووین! "خوای گەورە و میهرەبان، دەزانم کە ماوەیەکی زۆر: لەگەڵت قسەم نەکردووە..." ئێمە گەورەترین و بەنرخترین وانەکان لەکاتی دژواری دا فێردەبین. ئێوە لە چ کاتێکدا گرنگترین بڕیارەکانی ژیانتان داوە؟ پاش ڕوودانی کارەسات و دۆڕان و زەبرەکان، لەوکاتەدا کە ئەژنۆتان لە زەوی چەقیوە. بەمجۆرە نییە؟ لەم کاتانەدایە کە بەخۆمان دەڵێین: "ئەدی لە مایەهیچی و بێ هیوایی و بنەرزەخ ماندوو بووم. دەمەوێت شتێك بکەم. "ئێمە بۆ سەرکەوتنەکانمان جەژن دەگێڕین، بەڵام هیچی لێوە فێرنابین، لە کاتێکدا کە دۆڕانەکان هاوکات لەگەڵ ئێش و ئازاردا، فێرکەرن. ئەگەر سەیری رابردووتان بکەن دەزانن کە کارەسات و دژواریەکان، لەڕاستیدا خاڵەکانی وەرچەرخانی ژیانتانن.

مرۆڤە کارامەکان ناگەڕێن بەدووی کێشەکاندا، بەڵام ئەگەر ڕووبەڕووی کێشە ببنەوە لەخۆیان دەپرسن: "بۆ گۆڕینی کردەوە و بیرکردنەوەم پێویستم بە چی هەیە؟ چۆن دەتوانم لە ئێستام باشتر بم؟" بەڵام دۆڕاوەکان هەموو نیشانەکانی بەئاگاهێنانەوە لەبەرچاو ناگرن و کاتێك سەقفی خانووەکەیان دەڕوخێت، دەپرسن: "بۆچی هەموو بەڵاکان بۆ منە و بەسەر مندا دەشکێتەوە؟"

مرۆڤ گیانلەبەرێکی خووگرتووە و تا کاتێک کە ناچارییەک بۆ گۆڕان نەبینێت لەسەر ڕێگا هەمیشەییەکەی خۆی بەرەو پێش هەنگاو دەنێت. مێردی سارا، بەجێی دێڵێت. سارا بێتاقەت و بێزار، ماوەی حەوتوویەک خۆی لە ژوورەکەیدا زیندانی دەکات. بەڵام وردە وردە لەوحاڵە دێتە دەرەوە و دەڕواتەوە لای هاوڕێ کۆنەکانی و هاوڕێی تازە پەیدا دەکات. دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ، سارا لە رابردوو شاد و بەختەوەرتر دەبێت و بە خۆباوەڕیەکی زیاترەوە، درێژە بە ژیانی ئەدات. سارا سەرنج ئەداتە رابردووی خۆی و کارەساتی لەدەست دانی مێردەکەی بە باشترین ڕووداوی ژیانی دەنرخێنێت.

سۆران بێ ئیش دەکرێت. کاتێ لە پەیدا کردنی ئیشی نوێ ناهومێد دەبێت، ئیش وکارێکی ئاسایی بۆ خۆی ڕێ دەخات. ئێستاکە بۆ یەکەم جار لە ژیاندا، سۆران بەرپرسی خۆیەتی و ئیشێک دەکات کە بەڕاستی خۆشی دەوێت. ئەو هێشتاکە کێشەی زۆری هەیە بەڵام ژیانی ئەو، زیندوویی و مانایەکی نوێی گرتووە و هەموو ئەم شتانە ئەنجامی ئەو کارەساتەی یەکەمە.

## کەوایە دەتوانین بڵێین ژیان، کۆمەڵێک لە کارەساتە بەئازارەکانە؟

نە، پێویست ناکات. جیهان بە ئیشارەتێکی سووک گورمشتمان لێ ئەدات و کاتێک کە گوێنەدانی ئێمە دەبینێت، بە پیک سەرمان دەکوتێت.

زۆرترین ئازارەکان لە کاتێکدایە کە لە بەرامبەر گەشەدا، خۆڕاگری دەکەین.

## وانەکانی ژیان

بڕێك لە شتەکان لەسەرووی تێگەیشتنی ئێمە دان... کاتێك کە منداڵێك بە نەخۆشی ئەیدزەوە لەدایك دەبێت، کاتێك حە دایکێکی لاو لە پرۆسەی دزییەکی چەکدارانەدا دەکوژرێت، کاتێك کە لافاو لادێیەك وێران دەکات ئێمە لەگەڵ پرسیارێك رووبەڕوو دەبین کە واهەست دەکەین هیچ وەڵامێکی نییە: "بۆچی؟" بەڵام لە ئاستی ژیانی رۆژانەدا، بەردەوام دەتوانین کۆمەڵێك هۆکاری سەرەتایی بەدەست بهێنین.

ئایا سەرنجتان داوە کە بڕێك رووداوی تایبەت بۆ کۆمەڵێك لە کەسە تایبەتیەکان روو ئەدات؟ دلێر هەموو شەش مانگ جارێك دەردەکرێت، کاروان بەردەوام لە سەفەردا دڵی تێکەڵ دەبێت، یادگار هەموو ساڵێك ئیشی دەکەوێتە مەحکەمە و ...

بڕێك لە رووداوە تایبەتەکانیش بۆ کۆمەڵێك لە کەسانی تایبەت روو نادات. کاروان هەرگیز دەرناکرێت، دلێر هەرگیز تووشی مەحکەمە نەبووە و یادگار هەرگیز دیاری نەخۆشخانەی پێ نەگەیشتووە.

هەر کەسێك وانەی تایبەت بەخۆی فێردەبێت. ئێمە دەتوانین بە سێ جۆر دژکردەوەمان هەبێت:

١- ژیانی من کۆمەڵێك وانەیە کە پێویستم پێیانە، وانەگەلێك کە بە رێكوپێکی لە ژیانم دا روو ئەدەن. (ئەم شێوە

باشترین ڕووبەڕوو بوونەوەیە و زۆرترین ئارامی ئیشك گەرەنتی دەکات.)

٢- ژیان کێبەرکێ یەکە بۆ تاقیکردنەوەی بەخت، بەڵام من لە هەر کارەساتێك کە ڕوودەدات زۆرترین کەڵك وەردەگرم. (ئەمە دووهەمین هەڵبژاردنی چاکە و چێژێکی ناوەندی بە ژیان دەبەخشێت.)

٣- بۆچی بەردەوام هەموو بەڵاکان تووشی من دەبێت؟ (ئەم شێوە ڕووبەڕوو بوونەوە، ئەوپەڕ بێ هیوایی و بەدبەختی گەرەنتی دەکات.)

ئێمە لە سەرانسەری ژیاندا لەگەڵ وانەگەلێکی نوێ بەرەڕوو دەبینەوە و تا ئەوکاتەی کە وانەیەك فێرنەبین ناچارین کە سەرلەنوێ ئەو وانەیە بخوێنینەوە.

گرنگ نییە کە چی ناو دەنێن. ئەمری خواوەند، سەرهەڵدانی سروشتی ڕووداوەکان یان...، گرنگ نییە کە پەسەندی دەکەن یان ڕقتان لێیەتی، لەهەر حاڵێکدا بێت، ئەمە ڕاستی ژیانە. چ بەرپرسیارێتی قبوڵ بکەن و چ ڕۆڵی قوربانیەك بگێڕن، چ شەڕی لەگەڵ بکەن و چ گوێی نەدەنێ و لێی تێپەڕ بن لەهەر حاڵێکدا بێت، ئەمە ڕاستی ژیانە، ڕاستیەك کە ڕوو ئەدات، ڕاستیەك کە لە هەموو تەمەنتان دا ڕووی داوە. هەر جارێك کە هاوسێیەك خراپ بەکاری هێناون هەرجارێك کە دوکانداریك هەڵیخڵەتاندوون و هەرجارێك کە هاوڕێیەکتان ناجوانمێرانە بەجێی هێشتوون، وانەیەك لە بەردەمتان دا بووە. ئەگەر هەموو ڕۆژەکانی حەوتوو هەست بە بەدبەختی دەکەن لەوانەیە لە وانەیەکدا دەرنەچووبێتن. ئەگەر بەردەوام ئیش و پارە و هاوڕێکانتان لەدەست

ئەدەن ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە گرنگی و سەرنجتان نەداوەتە وانەکانی ژیان. خانمێك دەیوت: "تەنانەت کاتیٚ کە جل‌وبەرگ دەگۆڕم دووبارە لەگەڵ کێشەکانی رابردوودا بەرەورووەدەبمەوە!"

خراپترین شت کە دەتوانین بڵێین ئەوەیە کە: "نە، دادوەرانە نییە!"

## کورتەی وتە

ئێمە بۆ سزادان لەدایك نەبووین، بۆ فێربوون هاتووین. هەر رووداوێك لە ژیانی ئێمە هێزی سروشتی ئەوەی لەگەڵ دایە کە ئێمە بگۆڕێت و لەنێوان هەموو ئەو رووداوانەدا، سەختی و کارەساتەکان زۆرترین توانایان بۆ گۆڕینی شێوەی بیرکردنەوەی ئێمە لەخۆ گرتووە. بەشێوەیەك هەڵس‌وکەوت بکەن کە وادیارە لە سەرووی هەر کارەساتێکەوە، ئامانج و مەبەستێك شاراوەیە و بەمشێوەیەیە کە دەتوانن لە ژیاندا ئامانجتان هەبێت. لەدوای هەر کارەساتێك لە خۆتان بپرسن کە بۆچی پێویستم بەمە بوو؟ وە دواجار زاڵ بن بەسەریدا تا ناچار نەبن کە دووبارە ئەو وانەیە وەربگرنەوە.

## دەتوانم هەموو ئیشێك بکەم جیالەم ئیشە!

ئێمە بەزۆری حەزدەکەین گرنگترین وانەکان دوابخەین. دەتوانین سەیری پەیوەندی کاردوپەنێری خۆمان و دایکمان بکەین و بڵێین: "دوای ئەو قسەلۆکە ناشیرینانەی کە پێی وتم، دەتوانم هەموو شتێك بکەم جیالەوەی خۆشم بوێت." زۆر باشە! لەوانە لە ئێستادا ئامادەی ئەنجام دانی هەموو کارێك ببیت جیالە خۆشویستنی دایك و هەر

بەمهۆیەیە کە ئەمە، وانەی ئەمڕۆی تۆیە، خۆشویستنی دایك! مانای گەشە، ئەنجام دانی ئیشێکی نوێ و جیاوازە!

## مێردە کۆنەکەم بەردەوام وەکوو ئازارێك لە مێشکم دایە!

جیابوونەوە لە هاوسەر بەمانای کۆتایی پۆلەکەمان لەگەڵ ئەو نییە. ئەگەر ژیانی هاوبەش کۆتایی هاتبێت بەڵام ئێمە بەردەوام هاوسەری پێشتری خۆمان بەهۆی چارەڕەشی و قەرزاریەکانمانەوە لۆمە بکەین لەڕاستیدا هێشتا پێوە پەیوەندیدارین! وە تا ئەوکاتەی کە فێری وانەکانمان نەبین پێوەندیمان بەوە هەیە. ئێوە دەڵێن: " ئەم مرۆڤە وەکوو مەیمون وایە! من هەموو شتێك دەتوانم بکەم جیالەوەی لێی ببورم!" لێبوردنی، لەوانەیە لە دژوارەکان بێت و وادیارە ئێوە لەم بوارەدا ئەوەندە سەرکەوتوو نین، کەوایە دەبێت زیاتر هەوڵ بدەن و ئەمە، وانەی ئەمڕۆی ئێوەیە و تا فێری وانەکەتان نەبن پەیوەندیتان لەگەڵی دەمێنێتەوە. دەتوانن ئەم وانەیە دوابخەن بەڵام ئەگەر ئەتانەوێت کە ژیان و (تەندروستی)تان چاکتر بکەن دەبێ لەم وانەیەدا دەربچن. تا ئەو کاتەی لەسەر ئەو بڕوایە بن کە کەسێك ئەیەوێت ژیانی ئێوە لەناو بەرێت، هەر ئەم باوەڕە دەبێتە هۆی لەناوچوونی ژیانتان. لەوانەیە واهەست بکرێت کە ئەو دیوارە لەبەردەم بەختەوەری ئێوەدا، بەڵام لەڕاستیدا ئێوە دیواری بەردەم بەختەوەری خۆتانن.
بەرپرسەکەی من کەسێکی خراپە و خراپی ئەویش تاوانی من نییە، کەوایە ئەو دەبێ خۆی بگۆڕێت!

تا ئەو کاتەی لەسەر ئەم باوەڕە بن، بەرپرسەکەتان هەر بەوشێوەیە دەمێنێتەوە! کەوایە کێشەیەك نییە ئەگەر بە کەسێکی خراپی بزانن. بەڵام ئەگەر ئێوە بڕیاری گۆڕان بدەن بەو مانایە کە پەنجە لەسەر خاڵە پۆزەتیڤەکانی ئەو دابنێن، دادوەری لەسەر نەکەن و تەنانەت خۆ لەجێی ئەو دابنێن، ئەو کاتەیە کە بەتەواوی کێشەکە دەسڕدرێتەوە. دەپرسن: "چۆن؟" چەندین ئەگەر جیاواز هەیە....

١- لەوانەیە بەرامبەر بە گۆڕانی روانگەی ئێوە دژکردەوەی پۆزەتیڤی هەبێت و هەڵسوکەوتی بگۆڕێت

٢- لەوانەیە نەقڵی فەرمانگەیەکی دیکەی بکەن

٣- لەوانەیە ئێوە ئیشێکی دیکە وەربگرن

٤- لەوانەیە ئەو ئیشەکەی بگۆڕێت

٥- لەوانەیە حەز بە هاوڕێیەتی ئەم کەسە بکەن. (بەڕاستی!) تا ئێستا لەگەڵ چەند کەس بوونەتە هاوڕێ کە لەسەرەتادا توانای تەحەمول کردنیتان نەبووبێت؟ کاتێ ئێوە دەگۆڕدرێن بارودۆخی ئێوەش دەگۆڕدرێت و ئەمە، یاسایە، یاسایەك کە پێویستی بە شیکاری و لێدوان نییە. گۆڕانی ئێوە دەبێتە هۆی گۆڕانی هەلومەرج. بەڵام ئەم گۆڕانە دەبێ پاك و راستگۆیانە بێت. ئێوە دەڵێن: "من هیچ گلەییەکم لە هێمن نییە بەڵام هێشتا لەسەر ئەو بڕوایەم کە ئەو کەسێکی هیچ‌وپوچە!" بێ هۆ خۆتان فریو مەدەن ئەمە گۆڕانی پێ ناوترێت!

ئایا باشتر نییە کە هەر ئێستاکە واز لە ئیشەکەم بێنم لەدەست ئەم بەرپرسە هیچ‌وپوچە نەجاتم بێت؟ دەتوانی ئەمە بکەی بەڵام ئەگەری زۆرە کە تووشی بەرپرسێکی لەمە هیچ‌وپوچتر دەبی، هەموو ئەمانە

بەشێکە لە خوێندنەوەی ئەم جیهانە! گۆڕینی بەرپرسی بێ سودە خۆت بگۆڕە.

## لەوانەیە ئەگەر بۆ شارێکی تر سەفەر بکەم، بتوانم ژیانێکی نوێ دەست پێبکەم

هەڵیە! باشترین شوێن بۆ دەست پێکردنی ژیانێکی نوێ هەر ئەم شوێنەیە کە ئێستا تێی دان. هێمن لەبەرچاو بگرن کە بە زۆرێک هاوسێکانی قەرزارە. یادگار بەخۆی دەڵێت: " لەوانەیە باشتر وابێت لێرە بڕۆم"!" بەڵام مەسەلە لێرەدایە کە هێمن بۆ هەرکوێ بڕوات خو و بیرکردنەوەکانیشی لەگەڵ خۆی دەبات و هەر ئەم خو و بیرکردنەوانەیە کە شێوەی ژیانی ئەو دابین دەکەن. هێمن شارەکەی دەگۆڕێت بەڵام هەر ئەو هەل‌ومەرجانە سەرلەنوێ بۆخۆی درووست دەکاتەوە و تا وەئاگا دێتەوە خۆی لە گەماڕۆی قەرزارە تووڕەکاندا دەبینێتەوە.
ئەگەر ئێوە کەسێکی هەڵەخەرج بن و بۆ وڵاتی ئەرجەنتین سەفەر بکەن، دووبارە هەر ئەو کەسە هەڵەخەرجەن. باشترین پێشنیار کە دەتوانین بۆ هێمن هەمانبێت: "بەرلەوەی ناونیشانت بگۆڕی، بیرکردنەوەت بگۆڕە!"

## لە هەرکوێی دنیادا بین، وانەکا نمان، لەدوامانن.

لە بنەماڵەی رۆژین دا، پارە، وشەیەکی قێزەونە. باوك و دایکی رۆژین لەباری ئابوریەوە خراپ نەبوون. بەڵام حەزیان نەدەکرد کەس لە پارەدا هاوبەشیان بێت. رۆژین لەڕووی نەدەهات داوای پارە لە دایك و باوکی بکات. پاش ساڵەها رۆژین سەفەری کرد بۆ شارێکی دیکە و لەوێ

لەگەڵ کابرایەك ژیانی هاوسەری پێك هێنا کە داهاتێکی زۆری هەبوو، بەڵام هیچ شتێکی بە ئەو نەئەدا! کاتێ لە تەیارە دائەبەزن، وانەکانتان بۆ بەخێرهاتن کردنتان هاتوون بۆ پێشوازیتان.

## ئەگەر دەمتوانی بڕۆم بۆ (تەبەت) لەوانەیە لەوێ بەمانای ژیانم بگەشتمایە...

کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان ئاواتی گەورەیان بۆ سەفەر بۆ وڵاتە دوورەکان هەیە بەو هیوایە کە لەوێدا مانای ژیان وەدەست بێنن... یادگار دوای سەفەرێکی ماندوو و پڕۆکێنەر لە ئەنجامدا بە هیمالایا دەگات. ڕۆژێك لە حاڵێکدا کە لە سووچی شەقامێکی پیس دانیشتووە، لەتاو سکچوون خەریکە ئەمرێت و خەون بە حەمامێکی گەرمەوە دەبینێت لەناکاو بیرێکی تازە بەمێشکی دا تێپەر دەکات: "لەوانەیە بتوانم مانا و خۆشی ژیان لە شاری (رینز کارلتۆن)دا وەدەست بێنم!"
وەدەست هێنانی مانای ژیان لە (تەبەت)دا شاعیرانەیە بەڵام مانا و خۆشی (تەبەت) هی خەڵکی (تەبەت)ە! مانای ژیان بۆ زۆربەی کەسەکان لە سەیرانگاکانی دەوروبەری شارەکەیاندا شاراوەیە.

## وانەگەلێك کە لێیان دەترسین

تەنها ڕێگای زاڵ بوون بەسەر ترسدا، ڕووبەڕوو بوونەوەیە لەگەڵ ترسدا. وە بەزۆری بەرەو لای کارەساتێك دەکێشرێین کە ترسمان لە ڕووبەڕوو بوونەوەی هەیە.

کەوایە ئەگەر لە تەنیایی بترسن، تەنیایی دەکەنە دیاری بۆخۆتان، ئەگەر لە قەرزاری بترسن ئەگەری زۆرە کە هەموو ژێروژوورەکانی دەناسن و ئەگەر لە شپرزەیی و پەرێشانی ترستان هەیە، شپرز و پەرێشان دەبن. ئەمە، شێوازی ژیانە بۆ هاندانی ئێمەی مرۆڤ بۆ گەشە کردن.

## کورتەی وتە

هەموو کەس لە ئێمە هۆکارین. بیرکردنەوە و روانگەمان دەبێتە هۆکار بۆ درووست بوونی هەلومەرجی تایبەتی ئێمە و بەگۆڕانی ئێمە، هەلومەرجیش دەگۆڕدرێت. تا ئەو کاتەی وانەیەك لەسەر ئێش، قەرز یان هاورێکانمان فێر نەبووین یان هەر لەو پۆلەدا دەمێنینەوە و یان هەر ئەو وانە بەشێوازێکی دی تەجروبە دەکەین و ئەمە، سروشتی ژیانە. سەرەتا بە زیخێك پلتۆکێکمان لێ ئەدات کە لەڕاستیدا ئەمە ئاگادارییە و کاتێ ئەو زیخە لەبەرچاو ناگرین بە لەتە بلۆکێك لەسەرمان ئەدات و ئەگەر دووبارە هیچ وەرنەگرین، ئەمجارە سەرەی تەختە بەردە. ئەگەر راستگۆیانە سەیری رابردووی خۆمان بکەین زۆر نیشانەی ئاگاداری دەبینین کە بە بێبایەخیەوە لێی تێپەڕیوین و دووبارە بە گێژیەوە دەڵێین: "بۆچی من؟"

## ژیان کردن و فێربوون

"تەنها بە چوونە نێو قولاییەکانە کە دەتوانرێت گەنجینەکانی ژیان پەیدا بکرێت، لەوێدا کە هەڵدەکەون گەنجەکەتان شاردراوەتەوە.

هەر ئەو نەشکەوتەی کە لە چوونە ناوی دڵەڕاوکێتان هەیە دەتوانێت سەرچاوەی ئەو گەنجە بێت کە بەدوی دا دەگەڕێن."

(( ژۆزێف کمبل))

ژیان نابێت بەردەوام لەگەڵ دەرد و ئازار تێکەڵ بێت بەم حاڵەشەوە دەرد و ئازار هێشتاش هۆکاری بنەڕەتی گۆڕانی ئێمەیە. بەواتایەکی دیکە تائەو کاتەی کە ئازارمان نەبێت دەتوانین بەڕواڵەت بڵێین: "من زۆر باشم."

بەڵام کاتێك کە ڕووداوەکان بەئازار دەبن و بۆ نموونە کاتێك کە هەست بە تەنیاییەکی زۆر دەکەین ئەو کاتەیە کە ئامادەییمان تێدایە بۆ شکان و ئیتر وەڵامێکمان لا نییە، کەوایە واز لە ڕواڵەتی بوون دێنین. دەرد و ئازار، مرۆڤ هان دەدات بۆ جیدی بوون.

بەردەوام کاتێك باس لە دەرد و ئازاری خەڵکی بێت بە ئاسانی دەتوانین فەلسەفی لەگەڵ مەسەلەکە ڕووبەڕوو بین. سەیری هێمن دەکەین و دەڵێین: "ئیفلاس بوون دەرسێکی گەورە بوو بۆی." ئەسرین دەبینین و دەڵێین: "جیابوونەوەی بووە هۆی سەربەخۆیی." کەوایە ئێمە بەردەوام قبوڵمان کردووە کە شەڕەکانی ژیان، خەڵکانی دیکەی بەهێزتر کردووە. بەڵام کاتێك سەرەی خۆمان دێت، ئەوەندە بەئامادەییەوە سەیری مەسەلەکە ناکەین، ئێمە دەڵێین: "خوایە بۆچی ئەمە؟ نەتدەتوانی شەڕێکی ئاسانتر بۆ من هەڵبژێری!" بەداخەوە خەباتە ڕاستیەکان، قەت ئاسان نییە.

## تەنها ئەگەر دەمتوانی چەند مرۆڤــی راســتگۆ لــە ژیــانم دا پەیدا بکەم....

لەوانەیە سەیری ژیانی خۆمان بکەین و بڵێین: "ئەگەر ناچار نەبوومایە لەگەڵ ئەم مێردە تەمەڵ و منداڵە هاروهاجانە بەسەر بەرم دەمتوانی کاتێکم هەبێت بۆ گەشە و سەرکەوتووی تایبەتی خۆم..." هەڵەیە، گەشەی تاکەکەسی تۆ، بوون لەگەڵ ئەم کەسانە دایە. مرۆڤەکانی نێو ژیانی ئێمە، مامۆستاکانی ژیانی ئێمەن. ئەو پیاوانەی کاتی نووستن وڕێنە دەکەن و بەردەوام بیریان دەچێت دەرگای چەکمەجە ببەستن، ئەو منداڵانەی هیچ لەبەرچاو ناگرن و قەدرمان نازانن و ئەو هاوسێیانەی کە سەیارەکەیان لەبەردەم ماڵی ئێمەدا دەوەستێنن، هەر هەموویان تاکاتێك وا دەبن کە بە خۆمان دەڵێین: "ئەگەر ئەم کەسانە تۆزێك بەخۆدا دەچوونەوە دەمتوانی بەختەوەرتر بژیم!" ئەگەر هاوسەرەکەتان تووڕەتان دەکات پرۆژەی ئێوە دەبێت رووبەڕوو بوونەوەی کاریگەر لەگەڵ تووڕەیی ئەو بێت و بۆ ئەم مەبەستەش بەرامبەرێکی گونجاو لە ماڵەوە هەبە! چ بەختەوەریەك! لەوانەیە بڵێن: " لێی جیادەبمەوە! بەمشێوە هەموو کێشەکانم چارەسەر دەبێت".

## کورتەی وتە

هەر کەسێك کە دێتە نێو ژیانتانەوە، مامۆستایەکە. تەنانەت ئەگەر تووڕەشتان بکات، ئاوەهاش وانەیەکی فێرتان کردووە، چونکە سنوورەکانی ئێوەی پیشان داون. بەڵام ئەوەی کە خەڵکانی دیکە

مامۆستای ئێوەن نابێتە هۆکار بۆ ئەوەی کە دەبێت ئەوانتان خۆش بوێت.

## هەنگاو بە هەنگاو

ژیان وەکوو پەیژەیەکە. بۆ چوونەسەرەوە بەرەو پلەیەکی دیکە دەبێت ئەو پلەی کە لە ژێر قاچمان دایە، توند رایگرین. کەسانی جۆراوجۆر بە شێوەی جیاواز لەگەڵ ئەم پەیژانەدا رووبەڕوو دەبن:

١-"من رقمە لەم پەیژەیە حەز دەکەم لەسەر پەیژەیەکی دیکە بم" وە ئەو کاتەیە کە هەر لەو پەیژەدا دەمێنینەوە.

٢-"من پەیژەکەی ئەوم دەوێت." بەمە دەڵێین بەغیلی.

٣-"قێزم دێتەوە لەم پەیژەیە. من بۆ خوارەوە باز دەبەم." وە بەمە دەوترێت خۆکوژی.

هەرکات لە پەیژەیەکدا بە جیدی پرسیارتان لەخۆتان کرد: "لە کام پەیژەدا قاچم سفت دانەناوە؟"

## ژیان، چ کات ئاسانتر دەبێت؟

هیچ کات! بەڵام دەتوانین فێری ئەوە ببین کە لەگەڵ ژیان دا بە چاکی رێبکەوین. هەر لەو ساتەوە کە پەیماننامەی ژیان لەسەر عەرز ئیمزا دەکەین ئەرکی گوزەراندنی مەکتەبی ژیان دەکەوێتە ئەستۆمان و تا ئەو کاتەی کە هەناسە ئەدەین پۆلەکانی ئەم مەکتەبە بەرقەرار و بەردەوامە. ئێمە هەموو کات واهەست دەکەین کە دوای تێپەڕاندنی قۆناخی ئێستای ژیانمان (رەوزە، مەکتەب، لاوی و ... ) ژیانێکی

ئاسانتر لەبەردەم دا دەبێت. هیچ کەس ئێمەی ئاگادار نەکردۆتەوە! سەیرنییە ئەگەر هەست بە نائارامی و بێ هیوایی بکەین. ئێمە لە دوورەوە دەڕوانینە ژیانی خەڵکی دیکە و هەست دەکەین کە ئەوان لەسەر ڕێگایەکی پان وتەخت هەنگاو دەنێن لە حاڵێکدا هەر ئەو کەسانەش لەگەڵ کێشەی تایبەتی خۆیان بەرەوڕوون... ئەحمەد بەڕواڵەت ژیانێکی ئارامی هەیە. ئەو بە مانگانەیەکی زۆروە خانەنشین کراوە و قیستی خانووەکەش داوەتەوە، سەیارەکەی زۆر شازە، لە ریستۆرانتە گرانەکاندا خواردن دەخوات، بۆ سەفەر دەڕواتە دەرەوەی وڵات، یاری گۆڵف دەکات. بەڵام ئەو شتانەی کە ئێمە ئاگامان لێی نییە ئەمانەیە: ئەو سکاڵای هەیە لە شیرکەتی بیمە، سەقفی خانووەکەی دڵۆپە دەکات، کوڕەکەی موعتاد بووە و ئەمشەو قەرارە دز بڕواتە سەر ماڵەکەی! هەموومان بەردەوام تاقی دەکرێینەوە.

## هۆکارێکی دیکە بۆ ئاسانتر نەبوونی ژیان

کاتێک کە مەسەلەکان لەرادەبەدەر ئاسان دەبنەوە ئێمە بەدوی کێشەی گەورەتر دا دەگەڕێین. وە بەخۆمان دەڵێین: "من دەتوانم بەبێ چاویش ئەم ئیشانە جێبەجێ بکەم! من پێویستم بە خەباتێکی حەقیقی هەیە." کاتێک کە ژیان لە رادەبەدەر ئاسان دەبێتەوە ژیانی هاوسەرێتی دروست دەکەین! ئەمە تەنها دنیا نییە کە ژیانی ئێمە ئاڵۆز دەکات، خودی خۆشمان ئەمە دەکەین.

## چۆن دەتوانم لە تووڕە بوون خۆبپارێزم؟

بەستراوە بە چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونتان لەگەڵ کێشەکان. هیچ کات بەخۆتان مەڵێن: "من هیچ کات ناتوانم هەست بە ئاسوودەیی بکەم و چێژ لە ژیانم بەرم مەگەر ئەوەی کە..." هەرئێستا هەست بە ئاسوودەیی بکەن ولە ژیانتان لەزەت ببەن.

بەردەوام لەخۆتان پرسیار بکەن: " لەم مەسەلە چی فێر دەبم؟"

ئێمە هەرگیز ناتوانین ژیانی خۆمان لە شوشەی بچوك و خاوێندا بەسەر بەرین. مرۆڤەکان وەکوو وێنەیەکی دوور و بەدەست نەگەیشتوو سەیری بەختەوەری دەکەن، وەکوو ئەو کەسانەی لە بیابانێکی وشك و بێ ئاودا سەراوێك چاو بکەن بەنێو بەختەوەری و دەڵێن: " ئەگەر بتوانم خۆم بەوێ بگەیەنم ئەدی بەختەوەرم." ئەم جۆرە مرۆڤانە لەراستیدا بەخۆیان دەڵێن: " ئێمە ئێستا ناتوانین بەختەوەر بین چونکە خەریکی نوێکردنەوەی خانووین، بەڵام مانگی داهاتوو... " وە مانگی داهاتوو چونکە منداڵەکان تووشی نەخۆشی بوون، پشیلە دەیەوێت بزێت و خزم و کەس دەیانەوێت بۆ سەردان بێن، ئەمجارەش ناتوانن بەختەوەر بن و بڕیاری بەختەوەری دەگوازرێتەوە بۆ مانگەکانی ساڵی داهاتوو!

## بە کەسانی تر وانە بڵێنەوە

ئایا تا ئێستا ڕێکەوتووە کە دوای خوێندنەوەی کتێبێك کە زۆر باش بووە لاتان بیدەنە هاوڕێکەتان و بڵێین: " ئەم کتێبە بخوێنەوە، بێ

هاوتایه!" وه دواتر بێ سەبرانە چاوەڕێی تەلەفوونی بۆ سوپاسگوزاری بکەن و ئەو هەرگیز تەلەفوون نەکات؟

پاش شەش مانگ کە هەواڵی کتێبەکەتان دەپرسن ئەوکات دەزانن کە یان هەر نەیخوێندوەتەوە وە یان ونی کردووە. ئەو وانەیە کە لەم رووداوە فێردەبین ئەوەیە کە چونکە خۆمان ئامادەی وەرگرتنی زانیارین نابێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە خەڵکانی دیکەش ئامادە بن.

## کورتەی وتە

کاتێك کە خەڵکی پرسیارتان لێ ناکەن بەزۆری بەو مانایەیە کە زانیاریان ناوێت!

## لەم خاڵە دەبێت چ شتێك فێربین؟

ئەگەر بەشێوەیەکی زانستیانە بڕوانینە رابردووی خۆمان، لەوانەیە هۆکاری تێپەڕاندنی ئەو رێگایەی کە تا ئێستا تێپەڕبووە، بدۆزینەوە. بێ گومان کەسانێك لە رابردووتان دا دەدۆزنەوە کە رێنوێنی کردوون، مامۆستاکان، هاوڕێکانتان و تەنانەت ئەو نەناسراوەنەش کە لە تەکسی یان پاس دا لەگەڵتان دانیشتوون.

لەوانەیە کتێبێکتان وەبیر بێتەوە کە سالانێك لەوەپێش لە کۆنەفرۆشیەك دا دەستتان کەوتبێت و بەخوێندنەوەی ئەو کتێبە شێوەی بیرکردنەوەتان گۆڕا بێت. کارەساتەکان، نەخۆشیەکان، شکستەکان و قەیران ئابووریەکان وەبیردێننەوە کە ئێوەی بەهێزتر

کـردووه یـان وانـەی مێهرەبـانی و لێبـووردەیی فێرکـردوون، تووشـی بەدبەختی و چارەڕەشی دەبن کە لەئاستی خۆیدا بەشێك لە پرۆژەیـەکی گەورەتر بووه. لەوانەیە ئەو هەستەتان هەبێت کە لـە بەهـەموو تەمـەنتان لـەحاڵی فێربوونـدا بـوون، فێربـوونی وانەگـەلێك کـە لـە کـات و سـاتی دیاریکراودا هاتۆتە نێو ژیانی ئێوه. لەوانەیە بتوانن هەست بـەوە بکـەن کـە هــەر ڕووداوێــك بووەتــە هــۆی ڕوودانــی ڕووداوێکــی دیکــە. تێگەیشتن لە پەیوەندی عەقڵانی نێوان کارەساتەکاز و ناڕەحەتیـەکان، لـە سـەرەتادا، دژواره. تـا ئـەو کاتـەی کـە خـوا بـە تاوانبـار بـزانین لـەم بوارەدا گەشـە ناکـەین. لەوانەیـە شـەش مـانگ کـاتی بوێـت بـۆ ئـەوەی تێبگەین کە لە دەرکردنمان لە فەرمانگەدا حیکمەتێك شاراوه بووه!

ئـەم جیهانـە مامۆسـتایەکی بەسـەبر و تاقەتـە. بـۆ ئـەوەی ژیـانێکی ئارامتـان هـەبێت دەبـێ سـەرنج بدەنـە ئاگاداریـەکانی و جیـاواز لەمـە ئیفلاسی، جیابوونـەوە، جەڵدەی دڵ یان ئەزموونێکی ناخۆشـی دیکـە، بێگومان چاوەڕێتان دەکات.

## وانەکانی دواتری من لە کوێن؟

ئەم وانانە بەزۆری لە پێش چاومان دایە و ئێمە زۆربەی کات بەتـەواوی دەیانناسین بەڵام، ئەمانەوێت خودی خۆیـان ڕێگاکـان ببڕن و بڕۆن! بـێ سووده! دەبێ نمرەی دەرچوون وەربگرن.

لەم جیهانەدا، هەڵاواردن بوونی نییە.

سەرکەوتوویی و بەختەوەری ئێوە
بەستراوە بە کۆمەڵێك لە ئەسڵ و یاسا سروشتییەکانەوە و
چۆنیەتی کەڵك لێ وەرگرتنیان.

# بەشی دووەم

## یاسای چاندن و دەسکەوت

هۆکار و هۆدار

چەندە ئێوە باشتر بن، یارییەکە بەربلاوتر دەبێت.

رەفتار

نەرم بن!

## یاسا گشتگیرەکان

پێغەمبەرەکانی خوا و مامۆستا گەورە مەعنەویەکان، وانە بەنرخەکانی خۆیان لە شێوەی چیرۆکی سادەدا فێر مرۆڤایەتی کردووە. ئەوان لە چیرۆکەکانی خۆیاندا باسیان لە وەرزەکان و دانەوێڵە و ماسی کردووە، چونکە خەڵکانی ئەو رۆژگارە لە زمانی کەشاوەرزی و ماسیگیری باشتر دەگەشتن. بەڵام لە پشت ئەم چیرۆکە بە رواڵەت سادانەوە، کۆمەڵێک ناوەرۆکی زۆر قوڵ شاراوەیە. هەموو یاساکانی سرووشت لەم چیرۆکانەدا، کۆبوونەتەوە.

جیاوازی نییە کە ئێوە پسپۆڕی بەرنامە دانانی کەمپیوتەر بن یان شوانێک، لە هەرحاڵدا یاساکانی سرووشت بۆ هەمووان یەکسانە.

## یاسای چاندن و دەسکەوت

من لە یەکەمین کتێبمدا، "رازی شاد ژیان کردن"، سەبارەت بە کۆمەڵێك یاسای زاڵ بەسەر سرووشتدا قسەم کرد. لەم بەشە لە کتێبەکەدا دەمەوێت ئەو یاسایانە گشتگیر بکەم و ئیشەکەم بە یاسای چاندن و دەسکەوت دەست پێبکەم....

ئەو وانەیەی کە لێرەدا فێردەبین ئەوەیە کە "بۆ ئەوەی کە بەرهەمێکمان هەبێت دەبێ سەرەتا شەتلێك بچێنین". سەرەتا چاڵ هەڵدەکەنین و شەتڵەکە ئاو دەدەین (هەوڵ)، دواتر ماوەیەك چاوەڕێ دەکەین (سەبر) و ئەو کاتەیە کە دەتوانین بەرهەم بەدەست بهێنین، بەواتایەکی دیکە:

دەسکەوت=سەبر+ هەوڵ

بەڵام لە ژیانی ئێمەدا بەزۆری ئەم ئەسڵە ون بووە. ئێمە دەڵێین: "ئەگەر ئەمڕۆ نەمامێك دانێم سبەی چی وەدەست دێنم؟" و وەڵام ئەمەیە: " نەمامێکی بێ بەر." یاسای چاندن و دەسکەوت دەڵێت: "ئەمڕۆ بیچێنە، ماوەیەك چاوەڕێ بکە، ئەوکات بەرهەم!" لەوانەیە ئەگەر وەکوو سەردەمە کۆنەکان ناچار ببووینایە بەرهەمهێنەری خواردنەکانی خۆمان بین لەم بابەتە زیاتر دەگەشتین بەڵام، لە سەردمی خواردنە سەفەریەکاندا ژیان دەکەین.

یادگار دەڵێت: "ئەگەر ئیشێکی رێك‌وپێکم هەبوایە ئەوکات بەڕاستی چاك ئیشم دەکرد. بەڵام ئیشی من تەنها قاپ شۆردنە. کەوایە هەرگیز خۆم هیلاك ناکەم." غەڵەت بیردەکەیتەوە یادگار! ئەگەر باشترین قاپشۆری شار بیت ئەو کات بەتەئکید کەسێك دەبێت کە بایەخت پێ



Scanned by CamScanner

بدات یان ئیشێکی باشترت بداتێ و یان لانیکەم هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ئیشەی خۆت حەزت لێیە وەدستی بهێنی.

یاسا ئەمەیە: "سەرەتا دەبێ بیچێنی دواتر دروێنەی بکەی". ئێوە ناتوانن ئەم ئەسڵە تێك بدەن. ئەسرین دەڵێت: "مەقامێکی بەرزترم بدەنێ با ئیدی لە پشت مێزی ئیشەوە نەنووم." یادگار دەڵێت: "مانگانەکەم زیاتر بکەن لەبەرئەوەی لەوە بەدوا کەتر نەخۆش بکەوم." سارا دەڵێت: "ئەگەر ژیانی هاوبەشم سەرکەوتوو دەبوو لەگەڵ مێردەکەم میهرەبانتر دەبووم."

کارتە ئیعتباری و کاتەلۆگەکانی داواکردنی کالاّ، ئێمە هان ئەدەن کە ئەمڕۆ کڕین بکەین بۆ ئەوەی مانگی فوریە هیچ سوودێك نەدەین و لە مانگی مارس دا ئیفلاس ببین. لێرەشدا هەر ئەسڵی چاندن و دەسکەوت حوکم دەکات. ئایا باشتر ئەوە نییە کە لەجیاتی ئەوەی ئەمڕۆ بکڕین، سبەی پارەکەی بدەین، "سەرەتا پارە پەیدا بکەین و دواتر سەرفی بکەین؟" وانەیەکی تر کە لە باخچەیەکەوە فێردەبین ئەمەیە کە :"کاتێك کە چەند تۆمی لوبیا ئەچێنین، چەندین درەختی لوبیامان دەست ناکەوێت." یادگار تۆمی لوبیا دەچێنێت. بڕێکی با دەیبات و بڕێکیشی پەلەوەرەکان دەیخۆن، چەند دانەی دەسووتێت و لەئەنجام دا یادگار دوو درەختی بچوکی لوبیای دەبێت، وە ئەو دەڵێت: "ئەمە دادوەرانە نییە!" بەلاّم ژیان ئەمەیە.

بۆ وەدەست هێنانی چەند هاوڕێی چاك دەبێت کەسانێکی زۆر تاقیبکەنەوە. بۆ پەیدا کردنی فەرمانبەرێکی دڵخواز، دەبێ لەگەڵ پەنجا کەس چاوپێکەوتن بکەن. بۆ پەیدا کردنی چەند کڕیاری بەردەوام دەبێ

سەدان کڕیار ئەمدیووئەودیو بکەن. بۆ دۆزینەوەی خواردنێکی بەتام دەبێ چەندین ریستورانت تاقی بکەنەوە.
زۆرێك لە ئاوات، فەرمانبەر و تەنانەت هاوڕێکانی ئێوە دەبێ با یان پەلەوەران لەگەڵ خۆ ببەن و ئەمەش شتێك نییە کە بتوانرێت شەڕی لەگەڵ بکرێت، چاکتر وایە ئەم راستیە قبوڵ بکەن.

## هۆکار و هۆدار

ئەگەر ژیانی ئێوە وەستاو و بێ رۆحە دەبێ بزانن چیتان لێکردووە؟ ئێوە هیچ کات ئەم دێڕانە لە هیچ زمانێکەوە نابیستن: "بەیانی زوو وەخەبەر دێم، پەیوەندییم لەگەڵ خەڵکی دا باشتر دەکەم و هیچ رووداوێکی باش لە ژیانم دا روو نادات." ژیانی ئێوە سیستەمێکی وزەیە. ئەگەر هیچ رووداوێکی باش لە ژیانتاندا روو نادات، تاوانبار ئێوەن. ئەگەر قبوڵ بکەن کە بنەماکانی خودی ئێوە لەم سیستەمەدا، درووستکەری هەلومەرجی دەرەوەیە ئەوکاتەیە کە دەتوانن کۆتایی بە قوربانی بوونی خۆتان بهێنن. ئێمە دەتوانین سەیری ژیانی خەڵکی بکەین و بڵێین: "یاسای هۆکار و هۆدار چی بەسەرهات؟" سۆران بەخشش وەردەگرێت و ئێمە دەپرسین: "چۆن شایستەی ئەم شتە بوو؟" هاوسێکانمان چلەمینساڵیادی زەواجیان جێژن دەگرن و ئێمە دەڵێین: "بۆچی ئەوانە ئەوەندە بەختەوەرن؟" لەوانەیە سەرسووڕهێنەر بێت بەڵام یاسای هۆکار و هۆدار بۆ هەموو مرۆڤەکان، یەکسانە.
ئێمە لە ژیاندا ئەو شتە بەدەست دێنین کە داواکاری بووین. شڤان بە ئەڵماس و عەتر سەرنجی هاوسەرکەی رادەکێشێت، بەڵام کاتێ گوێی

لێدەگرین باس لەوە دەکات کە بەهۆی پارەکەیەوە بەشێوەی خراپ کەڵکی لێ وەردەگیرێت. ئەگەر بڕۆن بۆ ماسیگیری و لەجێی هەویر ئەڵماس بەکاربێنن بێگومان ماسیەك دەگرن کە ئەڵماسیان خۆش دەوێت! ئایا ئەمە سەیرە؟

## کورتەی وتە

ئەگەر لەگەڵ خۆمان ڕووراست بین دەتوانین پێرستی هەموو ئەو کارەساتانە کە بەسەرمان هاتووە بینووسین و دواتر بزانین کە خۆمان تا چ ڕادەیەك یارمەتیدەر بووین بۆ ڕوودانیان. نیگەرانی ئەوە مەبەن کە ئایا یاسای ئەم جیهانە بۆ هاوسێکەشتان بەڕێوەدەچێت یان نا؟ بۆ دۆزینەوەی ئەم یاسایانە ژیان، پەیوەندییەکان، سەرکەوتوویی و نائومێدیەکانی خۆتان بگەڕێن. تەئکید بن کە لەم ڕێگاوە دەتوانن بە ئارامی بیرکردنەوەیەکی قووڵ بگەن.

## چەندە ئێوە باشتر بن، یارییەکە بەربلاوتر دەبێت.

کاتێك لە یاریەکی بچوکدا سەرکەوتوو دەبین سەرەی یاری گەورە و گەورەتر دێت. مەکتەب لە پۆلی یەکەمەوە دەست پێدەکەین دواتر پۆلی دووهەم و ....سیستەمێکی کاریگەر و بەسوودە و ئەسڵ، ئەمەیە: "چەندە ئێوە باشتر بن، یارییەکە بەربلاوتر دەبێت." بەلام بەداخەوە ئەم یاسایەش لەنێوەی ڕێگادا ون دەکەین. یادگار بۆ دانەوەی قیستی ئۆتۆمبیلەکەی تووشی کێشە بووە. پاشکەوتی ئەو، دوای بیست ساڵ ئیشی بەردەوام، ڕێك هەشتاوحەوت سەنتە و ئەو دەڵێت: "ئەگەر یەك

ملیۆن دۆلارم دەبوو دەمزانی چۆن پارێزگاری لێبکەم!" هەڵەیە! ئەرکی یەکەمی تۆ ئەوەیە کە پاشکەوت کردنی دە دۆلار فێربی. دواتر سەرەی سەد و هەزاران دێت.... وە هەربەم جۆرە دەبێ بەرەو پێش بڕۆی تا بە ملیۆن بگەی.

دلێر، بەڕێوەبەری نووسینگەیەکی بچووکە، ئەو تەنها فەرمانبەرێکی هەیە و لەوانەیە ئەویش دەربکات! دلێر دەڵێت: "ئەگەر تەنها دە دوانزە فەرمانبەری چاکم دەبوو..." نە جیم، ئەگەر نەتوانی لەگەڵ دوو کەس دا ئیشەکەت بەڕێوەبەری لەگەڵ دوانزە کەسیش دا سەرکەوتوو نابیت.

ژیان، پێشکەوتنێکی بەرەبەرەیە. ئەو پرسیارەی کە بەردەوام گەلاڵە دەکرێت ئەمەیە: "لەگەڵ ئەو شتەی کە لە بەردەستت دایە چ دەکەی؟" وە تا ئەو کاتەی کە وەلام ئەمە بێت کە شتێکی وەها ناتوانم بکەم، ئومێدێك بە چاکسازی نییە.

## کورتەی وتە

جیهان بۆ هەوڵ پاداشت ئەدات، نەك بە بیانوو.

## هەر مەسەلەیەك دەبێتە ئەنجامی مەسەلەیەکی دیکە

پێشتر هەرکات لە ژیانم ماندوو دەبووم سەیری کەسە شاد و دڵخۆشەکانم دەکرد و بە سەرسووڕمانەوە پرسیارم لەخۆم دەکرد: "چۆن ژیانی ئەم کەسانە تا ئەم رادەیە، شیرین بووە،" دواتر ئاگادار دەبووم کە هەموو ئەم کەسانە لە بەشێك لە ژیانیاندا، هەنگاوی یەکەمیان بۆ شاد ژیان کردن هەڵێناوە و هەر ئەو هەنگاوەی یەکەم،

دەسپێکێك بووە بۆ هەنگاوەکانی دواتر. بڕێك جار هەڵەی گەورەی ئێمە "دێر رازی بوونی" ئێمەیە. پێشنیاری ئیشێکمان پێ دەکەن، رەتی دەکەینەوە و هۆکارەکەمان ئەمەیە: "ئەمە ئیشی دڵخوازی من نییە." بەلام ئەگەر ئیشێکی شیاوتر نەبێت باشتروایە کە هەر ئەم ئیشە قبوڵ بکەین، شارەزایی تێدا بەدەست بهێنین و ئاگادار بین کەلەم پەیژەوە بۆ پەیژەکانی تر بەرەوسەر دەچین. ئەگەر پێشنیاری گەورە بوونی نییە لە پێشنیارە بچووکەکانەوە دەست پێبکەن. (دڵتان بد،ن لە دەریا).

(جان مەك کورماك) بەسەرهاتی ئیش پەیداکردنی هاوڕێیەك کە ناوی (نیك) بووە بەمشێوە دەگێڕێتەوە: نیك ئاوارە بوو، هیچ پارەیەکی نەبوو و زمانی ئینگلیزیشی نەدەزانی. ئەو ئامادەی وەرگرتنی ئیشی قاپ شۆردن لە ریستۆرانێکی ئیتالی بوو. پێش لە چاوپێکەوتنی وەرگرتن، نیك رۆیشتە توالێتی ریستورانەکە و ئەوێی جوان خاوێن کردەوە. کاتی چاوپێکەوتن بەرپرسی ریستورانەکە لە خاوێن کردنەوەی توالێتەکە سەری سووڕمابوو کە ئەمە ئیش کێیە؟ لە راستیدا (نیك) کە زمانی ئینگلیزی نەدەزانی بەمکارە ئەم دێڕەی وتبوو: "من لە شۆردنی قاپدا، شارەزاییم هەیە."

نیك وەرگیرا، دوای حەوتوویەك بەرپرسی دابین کردنی زەلاتە ئیستقالەی کرد و نیك هەنگاوێکی تازەی بەرەو پلەیەکی بەرزتر هەڵگرت. ئێستاکە هەرکەس کە دەڵێت: "ئیش دەست ناکەوێت،" یەکسەر (نیك) و شۆردنی توالێتم وەبیردێتەوە.

## کورتەی وتە

لەهەر کوێوە دەتوانن دەست پێبکەن. بۆ هەر ئیشێك کە بۆتان دەرەخسێت ئەوپەڕی توانای خۆتان بەکاربێنن و تەئکید بن کە هەلەکان ئێوە دەدۆزنەوە. هەر پەیژەیەك، دەسپێکە بۆ گەیشتن بە پەیژەی دواتر.

## ( ئەسڵ )ی ( بۆق )ی

لەوانەیە چیرۆکی بۆق و کاسەی ئاوتان بیستبێت. ئەم چیرۆکە نموونەیەکی باشە بۆ یاسای "لەنێوچوونی بەرەبەرەیی".

ئەگەر بۆقێکی شاد و زیرەك بخەنە نێو قاپێکی ئاوی کولاّتوو، بۆقەکە چ دەکات؟ دەپەڕێتە دەرەوە! لە راستیدا بۆقەکە دەستبەجیّ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە چێژێکی لەمە نابینێت و دەبیّ بڕوات!

ئێستا ئەگەر هەر ئەو بۆقە یان یەکێك لە خزمەکانی بخەنە نێو قاپێکی ئاوی سارد و دواتر قاپەکە بخەنە سەر ئاور و بەرە بەرە گەرمای بدەنیّ بۆقەکە چ دەکات؟ دەحەسێتەوە... و دوای چەند دەقە بەخۆی دەڵێت: "دیارە ئاوەکە گەرم بووە." وە لە چاوپرتوکانێکدا بۆقێکی کولاّ ئامادەیە.

بەرهەمی ئەخلاقی چیرۆك؟ ژیان بەرەبەرە روو ئەدات. ئێمەش دەتوانین وەکوو بۆقی چیرۆکەکەمان گێژ بین و کات بەفیڕۆ بدەین و لەناکاو ئاگادار ببینەوە کە هەموو شتێك لەدەست چووە. هەموومان دەبیّ بەرامبەر بە رووداوەکانی ژیانمان ئاگا و بەخەبەر بین.

پرسیار: ئایا ئەگەر سبەی لەخەو هەستن و سەیرکەن کە بیست کیلۆ قەلّەو بوون نیگەران نابن؟ هەڵبەت کە دەبن! پەرێشان تەلەفون بۆ

نەخۆشخانە دەکەن: "ئەلۆ، فریاکەوتن، یارمەتی، یارمەتی، من قەڵەو بووم!" بەڵام ئەگەر هەر ئەم رووداوە بەرەبەرە رووبدات یەك کیلۆ ئەم مانگە، یەك کیلۆ مانگی داهاتوو و .... ئایا ئێستاکەش هەر ئەم دژکردەوەیە ئەنجام ئەدەن؟ نە! بەبێ گوێ پێدانی لێی دەگوزەرن.

ئەگەر لە رۆژێکدا دە دۆلار زیاتر لە داهاتەکەتان سەرف بکەن مەسەلەیەکی گرنگ نییە بەڵام ئەگەر سبەی و دووسبەی و رۆژەکانی دواتریش هەر بەمشێوەیە ئەمە درێژە پێبدەن ئەنجامەکەی ئیفلاسیە.

بۆ ئەو کەسانەی کە ئیفلاس دەبن، قەڵەو دەبن یان تەڵاق دەسێنن ئەم کارەساتانە لەناکاو روونادات - کەمێك ئەمڕۆ - کەمێك سبەی و لەئەنجامدا رۆژێك تەقینەوە! وە ئەوان بە سەرسوورمانەوە پرسیار دەکەن: "بۆچی ئەمە رووی دا؟"

ژیان توانای کەڵەکە کردنی هەیە. هەر رووداوێك دەچێتە سەر رووداوێکی دیکە وەکوو دڵۆپی ئاو کە بەرد کون دەکات. ئەسڵی بۆق ئێمە ئاگادار دەکاتەوە کە "ئاگاتان لە حەزەکانی خۆتان بێت" ئێمە دەبێ رۆژانە ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین: "بۆ کوێ دەڕۆم؟ ئایا من تەندروستر، شیاوتر، شادتر و دەوڵەمەندتر لە ساڵەکانی رابردووم؟" وە ئەگەر وەڵام (نە) بێت بەبێ وەستان دەبێ پێداچوونەوە بە ئیشەکانماندا بکەین.

لەوانەیە ئەم خاڵە ترسێنەر بێت بەڵام حەقیقەت ئەمەیە کە هیچ وەستانێك لە ئارادا نییە یان دەبێ بەرەوپێش بڕۆی یان هەڵکەون و بکەونە خوارەوە.

## دیسیپلین

نەزم و دیسیپلین لەبواری مەسەلە بچووکەکاندا کە حەزتان لێی نییە، بەڕێوەبەرن بۆ ئەوەی هەموو تەمەنی خۆتان بەو ئیشە گەورانەی کە خۆشتان دەوێن، تێپەڕێنن.

دیسیپلین، وشەی خۆشەویستی هەموو مرۆڤەکان نییە. لەڕاستیدا دیسیپلین لە لایەنی رادەی خۆشەویستیەوە جێگایەکی لە نزیک عەیادەی دانسازی و سکچوونەوە هەیە. بەڵام دیسیپلینی خۆیی دەتوانێت ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت. ژیان، تەریبێکە لە نێوان چێژە کاتی و پاداشتە درێژخایەنەکاندا. ئەرکدار کردنی خۆ بە بەڕێوەبردنی ئیشە بچوکەکان، وەکوو خوێندنەوە لەجێی سەیری تەلەفزیۆن، پاداشتی گەورە بۆ مرۆڤ بەدیاری دێنێت. وەکوو نموونە ئەرکدار کردنی خۆ بە بەڕێوەبەردنی چەندین کاری سادە وەکوو "سێ جار وەرزش لە حەوتوودا" دەبێتە پاداشتی گەورە "تەندروستی لەش". ئەرکدار کردنی خۆ بە بەڕێوەبردنی ئیشێکی بچووک "پاشەکەوت کردنی چەند دۆلار هەموو رۆژێك" دەبێتە پاداشتی گەورە "خانووی تایبەتی خۆت". کلیلی خۆ-دیسیپلینی بوونی ئیرادەیەکی ئاسنین نییە. ئەوەندە بەسە کە بزانین بۆچی شتێکمان ئەوێت ئەگەر بەڕاستی بزانین بۆچی ئەمانەوێت، لەژێر مەینەتی قەرز بێینە دەرەوە، پاشەکەوت کردن ئاسانتر دەبێت. ئەگەر بەروونی بزانین کە بۆچی بەدوای دەرەجەی بەرزترین، خوێندن ئاسانتر دەبێت.

خاڵێکی دیکە لەسەر دیسیپلین: ئەگەر خۆدی ئێوە بەڕێوەبەری دیسیپلینی خۆتان بن، ئیتر پێویست ناکات کە دیسیپلینی لە

شوێنێکی ترەوە بە ئێوە بوترێتەوە. لەئاکامدا زاڵن بەسەر ژیان خۆتاندا و کەسانی تر رێگاپیشاندەرتان نابن. بەڵام کاتێك کە دیسیپلین لە لایەن خۆتانەوە بەرێوەنەچێت بەتەئکید لە دەرەوەی خۆتان دەسەپێنرێت. ئەو کەسانەی کە هەستی خۆ-دیسیپلینیان نییە بەزۆری روو دەکەنە ئەو ئیشانەی کە ناچارن ئەمری خەڵکی دیکە بەرێوەبەرن.

## نەزم و رێك وپێکی

یەکەمین یاسای پەرەپێدان، نەزم و رێك وپێکییە وە هەر شتێك بۆ گەشەکردن پێویستی بە نەزم هەیە. سەیری گوڵێك بکەن، پرتەقاڵێك لەت بکەن، هاوتەریبی دارێك لەگەڵ کەنولە هەنوینێك تاوتوێ بکەن، هەموو ئەمانە نیشانەی نەزمە. سروشت، هەرچی بەپێویست بزانێت دەپارێزێت و زبڵەکان فرێ ئەدات، ئەم ناوی نەزم پێدانە.

ئەگەر ئەتانەوێت ئیش و کارتان گەشە بکات، ئەگەر دەتانەوێت ژیانتان چرۆ بکات، دەبێ پێرەوی نەزم و شێوەیەکی تایبەت بن.

یادگار دەڵێت: "ژووری ئیشەکەم تێکەڵ وپێکەڵە، بەڵام ئەمە شێواوییەکی بەنیزامە. من لە ئیشەکەم دا زۆر سەرکەوتووم!" بەراستی؟ ئێستا ئەوە وێنا بکەن کە یادگار بۆ عەمەلیاتێکی مێشك دەبردرێتە ژووری عەمەلیات و لەوێدا لەگەڵ ستاڤی عەمەلیات بەرەڕوو دەبێت کە لە نێوان دنیایەك لە باند و دەرزی و پنس و شووشە کۆنەدا وەستاون، دوکتۆر دەڵێت: "یادگار ئارام بە. راستە کە ئێرە زۆر شێواوە بەڵام ئێمە بەتەواوی سەیتەرەمان بەسەر بارودۆخەکەدا هەیە!"

لە هەر کوێیەک باس لە ئیشێکی بەرچاو دەکرێت، بەرنامەرێژی و نەزمیش بوونی هەیە. فەرمانبەرانی ئاگرکوژێنەوە بەردەوام دەزانن کە لەکوێدا دەبێ بەدوای کڵاوەکەیاندا بگەڕێن، شۆفیرەکانی ئۆتۆمبیلی فریاکەوتن بەردەوام جێگایەکی تایبەتیان بۆ کلیل هەیە.

لە بێ نەزمی، هیچ ئاکامێک بەدەست ناهێنن، چەکمەجەی فایلەکان رێک‌وپێک بکەن، دەستێک بە گەراجەکەدا بهێنن.

ئاگاداری ئەم خاڵەش بن: "لە کۆزە هەر ئەوە دێتە دەرەوە کە تێیدایە" بازنەی دەوروبەری ئێوە نیشانەی شێوەی بیرکردنەوەتانە. شێواوی و شڵەژاوی ماڵەوە بەزۆری نیشانەی شێواوی ژیانە.

## هیچ هەوڵێک، بێ ئاکام نییە

لەتێک سەهۆڵی تا پەنجا پلەی سانتیگراد سارد کراوە لەدەست بگرن و گەرمای بدەنێ. سەرەتا هیچ روو نادات. زۆرێک وزەی گەرمی سەرف دەبێت بەڵام هیچ ئاکامێک نابینرێت. وە لە ناکاودا لە پلەی سفردا سەهۆڵەکە دەتوێتەوە. ئاو! درێژە بە کارەکە بدەن. دووبارە زۆرێک وزە سەرف دەبێت بەبێ ئەوەی گۆڕانێک ببینرێت. تا ئەوەی کە بە گەرمای نزیکەی پلەی سەد دەگەین. بڵق و هەڵم! ئاو دێتە جۆش! وە ئاکام؟ ئەم ئەگەرە هەیە کە وزەیەکی زۆر سەرفی ئیشێک بکەین بۆ نموونە سەرفی پرۆژەیەک، ئیشێک و تەنانەت لەتێک سەهۆڵ - وە بەمەشەوە واهەست دەکەین کە هیچ ئاکامێکمان نەبووە. بەڵام لەڕاستیدا وزەی ئێمە شاراوە لە چاوانمان لە حاڵی درووست کردنی گۆڕاندا بووە. درێژە بە ئیشەکەتان بدەن و تەئکید بن کە گۆڕان روودەدات. ئەم ئەسڵە بە

مێشکتان بسپێرن، بێ هۆ تووشی دڵەڕاوکێ مەبن و مەهێڵن نائومێدی ڕەخنەتان تێبکات.
ژیان بۆ من وەکوو یارییەکە. هەرجار کە هەوڵ ئەدەم بۆنموونە مێزەکەم ڕێکوپێک دەکەم، کتێبێک دەنووسم، یارمەتی هاوڕێیەک ئەدەم. ڕاهێنانی وێنەکێشان دەکەم یان وەسڵێك واسڵ دەکەم، پوانێك بەخۆم دەدەم و وادەزانم کە ئاکامی هەموو ئەم هەوڵانە، چوونەسەرەوەی "باوەڕپێکراوی دنیایی" منە. هیچ کات نازانم کە بۆ گەیشتن بە پاداشتی دوایی، چەند پوانی دیکە دەبێ کۆبکەمەوە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە من لەو ئیشەی کە دەیکەم چێژ وەربگرم بێ ئەوەی کە بیر لە ئاکامی کاتی ئەوئیشە بکەمەوە. وە بەزۆری بەردەوام، ڕێك ئەو کاتەی کە چاوەڕوانی ناکەم پاداشتەکان وەردەگرم:
هەلومەرجێکی نوێ، بانگهێشت بۆ مەراسیمێك، سفتە و ....

## شەپۆلەکان

ژیان بەشێوەی شەپۆل ڕوو ئەدات. هەموو ئێمە شەپۆلەکانی دەنگ، شەپۆلەکانی تیشك و شەپۆلە مێشکییەکان دەناسین. بەواتای نازانستی هەر شەپۆلێك، نیشانەی مەیلێکە بۆ جووڵەی بەکۆمەڵ و (بۆڵ)ی.
ئەمە بەو مانایەیە کە قەیرانە بنەماڵەییەکان، کارتەکانی بانگهێشت کردن بۆ زەماوەند و خراپی ئۆتۆمبیل بەزۆری بەشێوەی کۆمەڵ دێتە پێشەوە. ئەم خاڵە بەباشی لەبەر بکەن. کاتێك کە مانگێك بەبێ وەرگرتنی هیچ وەسڵێك تەواو دەکەن، بەخۆتان بڵێن: "بڕێك پارە بۆ شەپۆلی دوایی وەلا دەنێم." من ئەم شەپۆلانە دەناسم، زۆر ناخایەنن."

## نەرم بن!

ئێمە لە دنیایەك دا دەژین کە هەموو شتەکانی لەحاڵی گۆڕان دان. وەرزەکان دێن و دەڕۆن، ئاوسان سەر و خوار دەکات، مرۆڤەکان وەردەگیرێن و دەردەکرێن... بەلأم ئایا بیردەکەنەوە کە مرۆڤ فێردەبێت کە یاسای ژێرخانی ئەم جیهانە "گۆڕان"ە؟ نە! لەجێی ئەوەی کە فێر بین، لەم گۆڕانکاریانە تووڕە دەبین.

لە وانەی زیندەوەرزانی دواناوەندی دا، یاسای "هەڵبژاردنی سرووشتی" یان "هاوسەنگی لەبەرامبەر گۆڕان"دا دەخوێنین. بۆ نموونە فێردبین کە ئەگەر گیانلەبەرێکی سەوزرەنگ لە عەرزێکی زەراعی خۆڵەمێشی دا ژیان بکات و رەنگی پێستی نەگۆڕێت ناچار بە لەناوچوونە.

ئەم گیانلەبەرە دەتوانێت شەڕ و ئاژاوە بنێتەوە: "عەرزی زەراعی دەبێ سەوز بێت – بەردەوام سەوز بووە.."

بەلأم ئاکامی ئەم شەڕ و دژەبوونە ئەوەیە کە بەزوویی هیچ شتێك لە گیانلەبەرەکە نامێنێتەوە. یاسایەکی بێڕەحمانە و یەکلاییە: "بگۆڕدرێ یان بمرە!" بەداخەوە کە ماموستایانی زیندەوەرزانی بە خوێندکارەکانیان ناڵێن: " ئەمە وانەی ژیانیشە نەرم بن."

لەجیهانی یەکبەشی ئەمڕۆدا هەموو شتێك لەحاڵی گۆڕان دایە و لەم بوارەدا تەنانەت گەورەترین کارناسانیش بڕێك جار تووشی هەڵە دەبن: لە ساڵی ١٩٢٧دا، (هری وارنر لە شیرکەتی سینەمایی برایانی وارنر) وتی:

"کێیە کە بیەوێت گوێی لە دەنگی ئەکتەرەکان بێت؟"

لە ساڵی ١٩٤٣دا، (توماس واتسۆن)، بەڕێوەبەری شیرکەتی ئای.بی.ئێم وتی: "من وادەزانم بازاڕی جیهانی بۆ نزیکەی پێنج کامپیوتەر، راکێشانی هەبێت."

له ساڵی ۱۹۷۷دا، (کێن ئولسێن)، بەڕێوەبەری شیرکەتی ئامادەکاری ئەلکترۆنی رایگەیاند: "هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی هەرکەسێك لەماڵەوە کامپیوتەرێکی هەبێت."

ئەوەی ئەمڕۆ دروستە لەوانەیە سبەی دروست نەبێت. ئەوەی ئەمڕۆ بەکار دێت، لەوانەی سبەی کارامەیی خۆی لەدەست بدات. تەنها واتای هەمیشەیی دنیا "گۆڕان"ە. باس لەسەر دادوەرانە بوون یان نەبوون نییە. هەموو شتێك لەم جیهانەدا لەحاڵی جووڵە و گۆڕان دایە. ئەگەر ماوەی سێ مانگ لە سەفەردا بن بەتەئکید کاتی گەڕانەوە هەست بە گۆڕانی منداڵەکانتان دەکەن و ئەمە، نەریتی ژیانە.

## کورتەی وتە

مرۆڤە بەختەوەرەکان جیالەوەی گۆڕانی ژیان قبوڵ دەکەن بەڵکوو ئەوە بەرێکەوتی باش وەردەگرن. ئەوان دەڵێن: "بۆچی دەبێت بمەوێت کە پێنج ساڵی داهاتووی ژیانم وەکوو پێنج ساڵی رابردووی ژیانم بێت؟" ئەو رۆڵی خۆی بەباشی بەڕێوە دەبات بەڵام بەداخەوە کە ژیانی پڕە لە ماندوویی و دڵشکان.

هەوڵ بۆ جێکەوتن لە پیچراوەکەی ژیانی داسەپاوی قۆناخی منداڵیدا، گیانلەبەرێکی چارەڕەش و بەبەزەیی لە مرۆڤ درووست دەکات. ئەگەر پێچراوەی ژیانی من ئەمە بێت کە "من مامۆستایەکی قوتابخانەم" بە لەدەست دانی ئیشەکەم ئەدی من هیچم نامێنێتەوە.

ئەو ساتەی چارەنووس درووست دەکات لێرەدایە...

ژیانی ئێوە، ئاوێنەی تەواوی
باوەڕەکانتانە.

کاتێك کە باوەڕەکانتان سەبارەت بەژیان (بەبیرتر) قووڵتر
دەگۆڕن،
ژیانی ئێوەش هەربەوپێیە
لەبەرەدەم گۆڕاندا دەبێت.

# بەشی سێهەم

باوەڕەکان و بڕواکان

کێشەی من، ئیشی منە.

پارە پەیداکردن

ڕێزی زۆر لەخۆتان بگرن

گرنگ نییە چی ڕوو ئەدات.....

## باوەڕەکان و بڕواکان

کاتێك کە مرۆڤەکان سەبارەت بە سنووردارییەتیەکانی خۆیان موناقشە دەکەن، دەڵێن: "من ناتوانم × ئەنجام بدەم چونکە... " وە بیانوی باو ئەمەیە: "ئیتر، من بەم جۆرەم، " لەڕاستیدا دەبێت بوترێت: "من وادەزانم کە بەمجۆرەم."

ئێمە دەتوانین بە خوێندنەوە لەسەر ماسی شتگەلێك سەبارەت بە باوەڕەکان و بڕواکانی خۆمان فێر ببین. حەوزێکی ماسی دابین بکەن و بەبەکارهێنانی دیوارێکی شووشەیی روون دوو کەرتی بکەن. ئێستا ماسیەکی گەورەی راوچی و ماسیەکی سپی بچووك کە خواردنی

بەتامی ماسی راوچیە دابین بکەن. هەرکام لە ماسیەکان لە بەشێك لە جەوزری ماسیەکەدا دابنێن.

لەچاوترووکانێکدا ماسییە راوچییەکە بەرەو نێچیر هێرش دەبات و بەتوندی لە دیوارە شووشەییەکە ئەدات. وەردەچەرخێ و سەرلەنوێ هێرش دەبات و سەرلەنوێ... تەق!

چەند حەوتوو تێدەپەڕێت و ئێستاکە لوتی ماسیە راوچییەکە شین ومۆر بووەتەوە و لەکۆتاییدا ئەو گەشتووەتە ئەو ئاکامەی کە راوی ماسی سپی بەرامبەرە لەگەڵ ئازار و لەئەنجامدا واز لە وەدواکەوتنی دێنێت. ئێستا دەتوانن دیوارە شووشەکە لابەرن. بەڕای ئێوە چی ڕوو ئەدات؟ ماسیە راوچیەکە تا کۆتایی تەمەنی روو لە نیوەی دیکەی حەوزی ماسیەکە ناڕوات. لەحاڵێکدا لە چەند سانتیم لەولاترەوە نێچیرە بەتامەکە خەرکی مەلە کردنە، ماسییە راوچیکە لە برسا کەوتۆتە حاڵی مردن. ئەو پەی بە سنووردارییەتی خۆی بردووە و لەوە زیاتر هەنگاوێك نانێت. ئایا چیرۆکی ماسیە راوچیەکە، چیرۆکێکی حەزینە؟ ئەگەر بەمجۆرە بیردەکەنەوە باشتر وایە کە بزانن لەڕاستیدا ئەمە بەسەرهاتی ژیانی هەموو مرۆڤەکانە. ئێمە لەگەڵ دیوارە شووشەکان بەڕەروو نابین. دیوارە شووشەکانی ئێمە لەڕاستیدا دایك و باوك، مامۆستا و ئەو هاوڕێیانەن کە پێمان دەڵێن کە دەتوانین چ بکەین، بۆ کوێ دەتوانین بڕۆین و ... وە لەهەمووی خراپتر، دیواری شووشەیی باوەڕ و بڕواکانمانە. ئەو باوەڕ و بڕوایانەی کە دیاریکەری چوارچێوەی توانای ئێمەن و ئێمە هەنگاوێك لەوانە زیاتر هەڵناگرین. ماسیە راوچیەکە دەڵێت: "من جارێك هەموو هەوڵی خۆم دا و ئێستا ئیتر تەنها لە

سنوورەکەی خۆمدا مەلە دەکەم." ئێمە دەڵێین: "من یەکجار ئەوپەڕی هەوڵی خۆم بۆ خوێندن (ژیانی هاوبەش، ئیش، ...) داوە.."
ئێمە داهێنەری قەفەسی شووشەیی خۆمانین و واهەست دەکەین کە ئەمە راستییەکە. لەڕاستیدا ئەمە تەنها شتێکە کە باوەڕمان پێکردووە و بەڕای ئێوە خەڵکی تا چ رادەیەك، بەرامبەر بە باوەڕەکانی خۆیان دەمارگرژن؟ ئەگەر نازانن ئەوەندە بەسە کە سەبارەت بە ئایین یان سیاسەت لە باس میوانیەکدا بکەن!

## بەلام من دەزانم کە من درووست دەڵێم!

ئایا پێکەنینی نییە؟ هەموو ئێمە کەم تا زۆر باوەڕی جیاوازمان سەبارەت بە جیهان هەیە و هەمووشمان وادەزانین کە باوەڕەکانمان دروستە!
بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئێمە دروست دەڵێین! یادگار لەو باوەڕە دایە کە ژیان سەخت و دژوارە و ئەوەی کە دەبێ بۆ زیندوو مانەوە حەفتا کاتژمێر لە حەوتوودا ئیش بکات. ئەو ئاگادارییەك بۆ وەرگرتن لە رۆژنامەدا دەبینێت: " ساعەتەکانی ئیش کردن دەگۆڕدرێت، سەفەری جۆراوجۆر لەکاتی ئیش دا، ئۆتۆمبیل، مانگانەی زۆرباش". یادگار دەڵێت: "ئەوەندە باشە کە ناتوانرێت راست بێت. بەتەئکید فێڵێك لەئارا دایە". یادگار درێژە بە گەڕان ئەدات و ئاگادارییەکی دیکەی وەرگرتن سەرنجی رادەکێشێت بۆ گەیشتن بەم شیرکەتە دەبێ دوو کاتژمێر رێ ببڕێت چەندین کاتژمێر ئیش بکات و مانگانەیکەی زۆرکەم

وەربگرێت و جیالەوەش شیرکەت ئۆتۆمبیلی پێ نادات. یادگار دەڵێت: "ئەیمان بۆ خوێندنەوە نرخی زۆرترە!"

یادگار لە چاوپێکەوتنی وەرگرتندا بەشداری دەکات. بەڕێوەبەری شیرکەت دەڵێت: "بەرهەمەکانی ئێمە زۆر خراپن، کڕیارەکان لە ئێمە بێزارن، خاوەنی ئێرە دەستبڕە. دەبێ شێت بیت ئەگەر بتەوێت لێرە ئیش بکەیت!" وە یادگار دەڵێت: "لە چ کاتێکەوە دەتوانم دەست پێ بکەم؟" لەڕاستیدا یادگار دەیسەلمێنێت کە تیۆریەکەی سەبارەت بە ژیان درووستە. ئەو بەدبەختە بەڵام لانیکەم لە بەدبەخت بوونی رازیە.

لە نێوان ساڵەکانی گەشەدا لە مامۆستا و دایك و باوك و هاوڕێکانمان، کۆمەڵێك قسە دەبیستین وەکوو: "بیرکاری تۆ هیچ ئومێدی نییە، دەنگت وەکوو سۆنە وایە و .... " لەڕاستیدا ئەوان دەڵێن: "ژیان، سەخت و دژوارە، تۆ بەردەوام دۆڕاو دەبیت، رەخنە لە حکومەت بگرە... ئەمەیە پێچراوەکەی تۆ، بڕۆ لەگەڵ ئەو ژیان بکە!" وە دواتر ئێمە دەڕۆین و کەم تا زۆر وەکوو تیاترێك، هەر ئەم دیمەنانە دووپات دەکەینەوە. ئێمە باوەڕمان بە هەموو ئەم قسانە هێناوە، تەنانەت ئەگەر ژیانیشمان لەناو بەرن.

ئەگەر بە یادگار پێشنیار بکەن کە بەرامبەر بە شتێك کە چل ساڵ قبوڵی کردووە گومان بکات ئەو لەوانەیە زۆر نیگەران و تووڕە دەبێت: "من چل ساڵی تەواو لەگەڵ ئەم باوەڕانە، بەدبەختانە ژیاوم ئێستاکە ئێوە دەتانەوێت هەموویان لەبیر بکەم و باوەڕ بەوە بکەم کە خۆم هۆکاری هەموو ئەم بەدبەختیانە بووم؟" زۆربەی ئێمە، مافداری زیاتر لە شاد ژیان کردن پەسەند دەکەین.

## پێچراوەی من چییە؟

هەموو ئێمە پێچراوەیەکمان بۆ خۆمان هەیە. ئێمە مارك لە خۆمان ئەدەین... "من مامۆستایەکی قوتابخانەم" ، "من دایەگەورەیەکم" ، "من گەنجێکی جیلی نوێم". پێچراوەکەی ئێمە وەکوو بەرنامەیەکی کەمپیوتەری لە گوێماندا هێلانەی کردووە و ژیانی ئێمە کونترۆڵ دەکات. ئێمە ئەم بەرنامەیە لەگەڵ خۆمان بۆ هەموو شوێنێك دەبەین – شوێنی ئیش کردن – پشوودان – میوانی و هەموو ژیانمان سەرفی جێکەوتنی پێچراوەکەمان دەکەین: "من بێوەژنێکم" ، "من لە ڕێگای مەعنەوی دا جێگیرم!"

ئێمە ئۆتۆمبیلێك دەکڕین، جل‌وبەرگێك لەبەر دەکەین، هاوڕێیەك هەڵدەبژێرین کە شیاوی پێچراوەکەی ژیانمانە.

دلێر دوکتۆرە. ئەو بەخۆی دەڵێت: "من دەبێ وەکوو دوکتۆرەکان هەڵس‌وکەوت بکەم و وەك ئەوان قسە بکەم. دەبێ خانووەکەم لە گەڕەکی دوکتۆرەکان دا بێت و ڕابواردنەکانم لە جۆری ڕابواردنی دوکتۆرەکان." ئەو ڕۆڵی خۆی بەباشی بەڕێوە دەبات بەڵام بەداخەوە کە ژیانی پڕە لە ماندوێتی و دڵشکاوی.

هەوڵ بۆ جێکەوتن لە پێچراوەی ژیانی داسەپاوی چاخی منداڵی، گیانلبەرێکی چارەڕەش و بەبەزەیی لە مرۆڤ درووست دەکات. ئەگەر پێچراوەی ژیانی من ئەمە بێت کە: "من مامۆستایەکی قوتابخانەم" بە لەدەست دانی ئیشەکەم ئیتر هیچ شتێك لە من نامێنێتەوە.

ساتی درووست کردنی چارەنووس لێرەدایە... ئێوە پێچراوەی ئامادەکراوی منداڵیتان نین و هیچ کات سەربە گروپ یان چینێکی تایبەتی نین.

کاتێك کە خەریکی نووسینی ئەم بەشە بووم لاشعور هاورِێ سویدی یەکانم وەبیرم هاتنەوە، (ئانا و پر ئریك). ئەم ژن و مێردە هەشتا ساڵانە ئێستاکەش خەریکی جیهانگەردین. (پر ئریك) لەگەڵ کورِەزاکەی یاری خلیسکێن لەسەر سەهۆڵ دەکات و (ئانا) تا کاتژمێر چواری بەیانی سەما دەکات. وادیارە کە ئەوان پێچراوەی منداڵی خۆیان لەبیر کردووە و بەردەوام زیندوو و بەوزە درێژە بە ژیانیان ئەدەن. ئایا تاکوو ئێستا لەم چیرۆکانەتان بیستووە: "من کەسێکی زۆر ناودارم و دەبێ خەڵکی بەمشێوەیە لەگەڵ من هەڵسوکەوت بکەن و رێزم بۆ دانێن!" کۆمەڵێك لە خەڵکی پێداگرن کە خۆیان بە کەسانی دیکە بناسێنن و سەرمایە و خوێنەواری خۆیان بکەنە فەرخ بەسەر خەڵکدا، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە لە دەروونی خۆیاندا ئازار دەچێژن چونکە شادی ئەوان لە گرەوی بیرکردنەوەی کەسانی تر دایە. "ناودار بوون" لەبیر بکەن بۆ ئەوەی ئارامی بە نەسیبتان بێت. هەرچی کەمتر پێویستتان بە ستایشی خەڵکی هەبێت، زیاتر ستایش دەکرێن.

"من لەو کۆمەڵە کەسانەم کە هەرگیز... ( نارِۆم بۆ تیاتر، جلوبەرگی رەسمی لەبەر ناکەم، بە بیتاقەی نمرە یەك سەفەر ناکەم)." کاتێك لە وشەی "هەرگیز" یان "بەردەوام" کەڵك دەگرین خۆمان لە قەفەسێکدا زیندانی دەکەین. بەڵام لێرەشدا هەر باس لەو پێچراوەی منداڵیەیە کە پێویستی بە پێداچوونەوە و گۆرِانکاری هەیە.

"من لەوە بەتەمەنترم کە ..." دایکی من نووسینی یەکەم کتێبی لە تەمەنی شەست و حەوت ساڵیدا دەست پێکرد. ئەو لە تەمەنی شەست و هەشت ساڵیدا چاوی لێکنا و هەرگیز ئەو کتێبەی تەواو نەکرد.بەلاَم ئەو ئیشەکەی دەست پێکردبوو و هەربەم هۆیەش لە دوایین رۆژەکانی ژیانی دا شادتر لە هەمیشە ژیا. تەنها رێگایەك بۆ تێپەڕاندن بوونی هەیە و ئەو رێگایەش، رێگای فێربوونە و رێگای عەشق پێکردنی هەتاهەتایی بەوەی کە ئەنجامی ئەدەین. ئەگەر کتێبێکی نیوەتەواو یان خانوویەکی نیوەدروستکراومان هەبێت و لەناکاو بمرین هیچ نیگەرانیەك لە دنیا لەگەڵ خۆمان نابەین؟

## کورتەی وتە

لەخۆتان پرسیار بکەن: "ئەگەر لە منداڵیەوە پێچراوەیەکیان بۆ ئامادە نەکردبووم، ئێستا خەریکی چ ئیشێك بووم؟"

## کام لە باوەڕەکانمان فڕێ بدەین؟

هەر باوەڕێك کە ئێمە هەژار و چارەڕەش دەهێڵێتەوە دەبێ فڕێ بدرێت. ئەگەر باوەڕ و بڕواکانتان یارمەتیتان نادەن، وازیان لێبهێنن. دانپیانان بە هەڵە بوونی باوەڕەکان بەس نییە. بوونی ئەم باوەڕانە دەبێتە هۆی دەرد و ئازار. بۆ دەسپێك بەرامبەر بەو باوەڕانەی کە وشەی "دەبێت"ی تیا بەکار دێت ئاگادار بن:

خەڵکی دەبێت وەلاَمی خۆشەویستی بدەنەوە!

خەڵکی دەبێت من ستایش بکەن! ئەگەر کردەوەیەکی باشم هەیە

مێردەکەم دەبێت سوپاسگوزاریم بکات.

خەڵکی دەبێت هوشیارتر بن!

خەڵکی دەبێت مافنانس بن!

لەوانەیە واهەست بکرێت کە ئەم "پێرستی دەبێت"گەلە، ریزبەندێك چاوەڕوانکراوی عەقڵانین. بەڵام ئەگەر ئەم باوەڕانەمان نەبێت چی روو ئەدات؟ کاتێك کە ئەم دەبێت گەلە بۆ خەڵکی دائەنێین بەڵام ئەوان گوێی پێنادەن هەست دەکەین کە بێ ئیحترامی و ناسوپاسیمان بەرامبەر کراوە بەڵام کاتێك کە ئەم "دەبێت"گەلە لەبیر دەکەین بێ لەبەرچاوگرتنی هەڵسوکەوتی کەسانی تر دەتوانین بەردەوام شاد و بەختەوەر بژین.

باوەڕ بە "دەبێت"ەکان هیچ یارمەتی ئێمە نادات چونکە دنیای راستیەکان، "دەبێت"ەکان ناناسێت. دەبێت و نابێتێك بوونی نییە. هەموو شتێك هەر ئەمەیە کە هەیە. کاتێك رەخنە لە راستیەکان دەگرین بەردەوام دۆڕاو دەبین.

## باوەڕ و بڕواکانی مرۆڤ، دابینکەری چۆنیەتی ژیانی ئەو کەسەن

نموونە: وای دابنێین کە ئێوە باوەڕتان بەوە هەیە کە باوکان دەبێت منداڵەکانیان هان بدەن و بۆ ئەوان دیاری بکڕن. هەرکاتێك کە باوکتان بەپێی ئەم باوەڕەی ئێوە هەڵسوکەوت ناکات خەمین و دڵرەنجاو دەبن

و لەئەنجامدا بڕیار دەدەن کە باوکتان بگۆڕن. زۆربەی خەڵکی هیچ کات بیر لەوە ناکەنەوە کە ڕێگاچارەیەکی دیکەش بوونی هەیە:

ئایا باشتر وانییە کە لەجێی باوک باوەڕەکانی خۆمان بگۆڕین؟

ئێوە دەڵێن: "بەڵام ئایا هەموو مرۆڤەکان باوەڕیان بەمشتانە نییە؟" نە! کۆمەڵێك باوەڕیان بەم قسانە نییە وبەم هۆیەش بەختەوەرترن. کۆمەڵێك قەت چاوەڕوانی هەڵس‌وکەوتێکی تایبەتی ناکەن و لە ئەنجامدا ئارامی مێشکی زیاتریان هەیە.

بۆ گۆڕانی ڕوانگەکان، پێویست بە توانای ئیرادە، باوەڕبەخۆبوون، یان عەمەلیاتی مێشك ناکات. تەنها شتێك کە پێویست دەکات غیرەتی بیرکردنەوە لە ڕێگا تازەکانە. جاری داهاتوو کە تووشی نیگەرانی و بێ هیوایی دەبن ئەم خاڵە وەبیر بهێننەوە کە هیچ کەس ناتوانێت بەقەدەر باوەڕەکانتان، ئێوە تووڕە بکات. بیرکردنەوە و خەیاڵاتێك کە دەبنە هۆی ئازاردانی ئێوە هەرچیش بن شتێك جیالە بیرکردنەوە نین و ئێوە دەتوانن بیرکردنەوەی خۆتان بگۆڕن.

## کێشەی من، ئیشەکەمە!

کاتێك کە گلەیی لە ئیشەکەمان دەکەین بەزۆری کێشە، خودی خۆمانین.

وای دابنێن کە ئیشی ئێوە هیلاککەرە و ئێوە باوەڕێکی لێکچووتان بەوە هەیە کە: "ئیش، هیلاککەرە." ئێستا ئەگەر خۆویستی ئیشێکی بەچێژ بن چی ڕوو ئەدات؟ لەدوو شێواز بەدەر نییە ١- ئەوان ئاگاداری خەمساردی و ماندوویی ئێوە دەبن و ئیشەکەتان پێ نادەن. ٢-

ئیشتان پێ ئەدرێت بەلام ئێوە وای رێکدەخەن کە ئەو ئیشە سەرنج راکێشە ببێتە ئیشێکی هیلاك و ناخۆش.

ئێستاکە وای دائەنێین کە باوەڕی ئێوە بە پێچەوانەوەیە و بەواتایەکی دیکە بەڕای ئێوە: "ئیش، چێژ و سەرگەرمیە." لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئیشەکەی ئێوە هیلاککەر بێت دەڵێن: "ئەم ئیشە، حەز و ئاواتی من دەخنکێنێت و بەپێچەوانەی باوەڕەکانی منەوەیە و تەنانەت یەك رۆژی تریش لێرە نامێنمەوە." بنەمایترین باوەڕەکانی ئێوە، بزوێنەرێك دەبن بۆ دۆزینەوەی ئیشێکی باشتر.

ئەوەی دەبێتە هۆی جیاوازی ئیشەکەتان نییە، باوەڕەکانی ئێوەیە.

## پارە پەیدا کردن

## بەلام من بەقەد پێویست پارە بەدەست ناهێنم!

سارا دەڵێت: " ئێوە ئاگادار نین. کێشەی من، ئیشەکەی منە چونکە من بەقەد پێویست پاردم لێ دەست ناکەوێت! ئەمە پەیوەندی بە سیستەمی باوەڕی منەوە نییە."

باشە سارا، کەوایە بۆچی لێرە ئیش دەکەی؟

سارا دەڵێت: "ئەمە تەنها ئیشێکە کە دەتوانم بیکەم!"

زۆر باشە سارا، ئەگەر ئەمە باوەڕەکانتە، باوەڕت بگۆڕە! ئیشێکی دیکە بدۆزەرەوە، ئیشێکی نیوەرۆژ دەست پێبکە، سامانێك بە باری ئابووری ژیانت بدە، شارەزایی نوێ فێرببە، بۆ بەرزبوونەوەی مەقام هەوڵ بدە..

سارا دەڵێت: "بەلام رۆژگارێکی خراپە. رۆژنامەکان وا دەڵێن." نە سارا، پەیوەندی بە رۆژنامەکانەوە نییە، ئەمە، **باوەڕی تۆیە**. مەرجی

بەختەوەری ئەوەیە کە فەرمانبەری مێشکی خۆمان بین و بەها بە قسەی هاوسێ و ڕۆژنامەکان نەدەین.

## بـــەڵام مـــن مانگانەیـــەکی دیـــاریکراوم هەیـــە...

پەیوەنـدی بـە مانگانـەی دیـاریکرا و نـەکراوەوە نییـە. سـەرمایە و بەختـەوەری ئێـوە، لـەژێر کاریگـەری بـاوەڕ و بڕواکانتـان دایـە. هەشت فەرمانبەر کە هەموویان لە یەك شیرکەت دا ئیش دەکەن و مانگانەیەکی یەکسانیان هەیە لەبەرچاو بگرن. بەتەئکید لـە نێو ئەم هەشت کەسـەدا ژمارەیەك دەبیننەوە کە ژیانێکی باشیان هەیە و ژمارەیەکی دیکە کە بۆ کڕینی خواردنێکی سادە پێویستان بە وامی بانك هەیە. جیاوازی ئەم دوو گرووپە لە ڕادەی داهاتیان دا نییە بەڵکوو جیاوازی لە باوەڕێك دایە کە بەرامبەر بە پارە هەیانە. ئەگەر من ئەو ڕادە پارەیـەی کـە دەمـەوێت بەدەسـتی نـاهێنم، یـان بەدەسـتی دێـنم و لەدەسـتی دەدەم، بەتەئکید هۆکارێـك هەیـە و نابێـت بـۆ ئـەم هۆکـارە لـە دنیـای دەرەوەدا بگـەڕێین، هەموو شتێك پەیوەندی بە دنیای دەروونی منەوەی هەیە.

بڕاوەکانی بەخت ئازمایییە جۆراوجۆرەکان نموونەیەکی باشە بۆ نیشان دانی ئەو ڕاستییەی کە "سەرمایەی مرۆڤ، لـەژێر کـونترۆڵی سیستەمی باوەڕەکـانی ئـەو دایـە." خـەڵك وابیردەکەنـەوە کـە پـارە، چارەسـەری کێشەکانە. ئەگـەر وایـە بۆچـی زۆربـەی بڕاوەکـانی بـەخت ئازمایییـە گەورەکان دوای تێپەڕبوونی ماوەی دوو ساڵ، قەرزارتر و هـەژارتر لـە ڕۆژی یەکەمی خۆیان بوون؟ چونکە سیستەمی باوەڕی کە دەڵێت: "من بەردەوام ئیفلاسم" بەخێرایی یەك میلیۆن دۆلار بەبا ئەدات.

ماوەیەك لەوەپێشە سەیری بەرنامەیەكی تەلەفزیۆنیم دەكرد. لەم بەرنامەیەدا لەگەڵ كەسێك چاوپێكەوتنیان دەكرد كە بۆ دووهەمین جار لە بەخت ئازماییەكی گەورە دا، براوە بوو. ئەو وتی: "ئەم ۱/۳ ملیۆن دۆلارە زۆر باشە بۆم چونكە لە حاڵی حازردا بە چارەڕەشی ژیان دەكەم..." وە ئەمە كەسێك بوو كە دوو ساڵ لەوە پێش مەبلەغێكی خەیاڵی دیكەشی بەخەڵات وەرگرتبوو! حیسابی بانكی هەر كەسێك بەردەوام لەگەڵ سیستەمی باوەڕی ئەو كەسە دەخوێنێتەوە. كاتێك كە باوەڕەكانمان لەگەڵ بڕی حیسابە بانكیەكەماندا جۆر نابێت ڕێگای ئاسانتر ئەوەیە كە حیسابی بانكیەكەمان بگۆڕین بەڵام ڕێگای درووست، گۆڕینی باوەڕەكانمانە. لێرەشدا، ژیانی ئێمە لەژێر كاریگەری بیركردنەوەكانی ئێمە دایە نەوەك هۆكارەكانی دەرەوە.

## پوانەكانی "ئیفلاس بوون"

ئەو كەسانەی كە لە ئیفلاس بوونی هەمیشەیی خۆیان سەرسووڕماون هیچ كات ئەم پرسیارە سادەیان لەخۆیان نەپرسیوە: "چ شتێكی ئیفلاس بوونم خۆش دەوێت؟" لاتان سەیر نەبێت! ئیفلاس بوون كۆمەڵێك سوودی هەیە. وەكوو نموونە:

"دەتوانم واهەست بكەم كە خوا منی خۆش دەوێت چونكە خوا هەژارەكانی خۆش دەوێت."

"دەتوانم جێگای خۆم لەنێو هاوڕێكانم دا بپارێزم. ئەگەر هەژار بم لای هاوڕێ هەژارەكانم هەست بە تاوان ناكەم."

"بەزەیی و دڵسۆزی خەڵكی بەدەست دێنم."

"پێویست ناکات که خووەکانم بگۆڕم."

"پێویست ناکات که خۆم ناچار به ڕێكوپێکی بکەم."

"وه باشتر لەهەر هەمووی... دەتوانم خەڵکی تاوانبار بکەم – وه حکومەتیش"

ئەگەر راستگۆ بین دان بەوەدا دەنێین که ئیفلاس بوون شیاوی ئێمه. ئاشکرایه که زۆرێك دان به "هەڵبژاردنی هەژاری"دا نانێن بەلاّم پێرستی سەرەوه، زۆر خڵەتێنەره، ئاوەها نییه؟

## باوەڕە ئابووریەکانی دایك و باوکی ئێمه

ئایا بەزۆری له دایك و باوکتان بیستووتانه که :

"پاره پەیدا کردن، ئاسانه."

"هەرکات پاره سەرف دەکەین، پارەیەکەی زیاتر دێته ژیانمانەوه."

"بەردەوام زیاتر له پێویست پارەمان هەیه."

وه یان ئەوەی که:

"پاره، سەرچاوەی هەموو کرداره پیسەکانه."

"ئێمه توانای دارابوونمان نییه."

"پاره، تووکی بەراز نییه."

ئەگەر پێرستی دووهەم بۆتان ئاشناتر بێت، پێدەچێت باوەڕی دایك و باوکتان بووەته حەقیقەت بۆ ئیوه و ئێستاکه ئێوه بۆ بەدەستهێنانی پاره له ئاو و ئاگر ئەدەن.

## لەگەڵ پارە، ئاسان هەڵسوکەت بکەن!

هیچ کات سەرنجتان داوە کە پارە دان بە کۆمەڵێك کەس، چەندە دژوارە؟ پێشنیاری پارە توورەیان دەکات! "نە بەهیچ جۆرێك، پێویستم نییە، بەڕاستی دەڵێم"

وە لە حاڵێکدا کە ئێوە دەزانن ئەوان بە ئاو و نانی وشك زیندوو ماونەتەوە. ئەوان راستیەکە کەتمان دەکەن و هەست دەکەن کە ئیهانەیان پێکراوە: " من پێویستم بە پارەی ئێوە نییە – بارودۆخم باشە."

کۆمەڵێك لە ئێمە تەنانەت لە باس کردن سەبارەت بە پارە، بێزارین! حەقدەستی حەوتوویەکمان بەقەرز دەدەین بە هاوڕێیەکمان بەڵام کاتێك کە پێویستمان بە پارە هەیە نازانین کە چۆن خواستەکەمان باس بکەین: "ئێ.... دەزانی کە.... لەبیرت دێ... باشە... مەسەلەکە زۆر گرنگ نییە و من ئەوەندە پێویستم پێی نییە... گرنگ نییە ئەگەر.. چۆن بیڵێم... بیرم دەکردەوە کە .... هەموو ئەمانە لەجێی خواستێکی سادە: "دەکرێت پارەکەم بدەیتەوە؟"

ئەگەر لە نیش یان پەیوەندیەکدا هەستێکی ئاسانتان نەبێت دێر یان زوو وازی لێ دێنن. سەبارەت بە پارەش، بارودۆخ هەر بەمشێوەیەیە ئەگەر لەگەڵ پارە ئاسان هەڵسوکەوت نەکەن، ئەگەر تەنانەت لەباس کردن سەبارەت بە پارە، توورە بىن زووبەزوو لەدەستی ئەدەن و مێشکی ئێوە بەشێوەی ناهوشیار ئەنجام ئەدات لەڕاستیدا مێشکی ئێوە، لە هەرشتێك کە لەگەڵی ئاسان هەڵسوکەوت ناکەن دووری دەکات.

## کورتەی وتە

بۆ ئەوەی شتێکتان لە ژیانی خۆتاندا هەبێت و پارێزگاری لێبکەن پێویستە کە لەگەڵی هەست بە ئاسانی بکەن. بۆ پارە پەیدا کردن و پارێزگاری کردن لە پارە، ئاسان هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ بکەن!

## ئەگەر من پارەی زۆرم هەبێت، خەڵکی بێ پارە دەبن.

ئەمە گەوجانەترین باوەڕە. چەند کەس لە ئێوە لەگەڵ ئەم باوەڕە کە "ئەگەر من بەختەوەر و دەوڵەمەند بم خەڵکی ئازار دەچێژن" گەورە بوون. ئایا دەزانن کە چ کەسانێك ئەم قسانە دەکەن؟ ئەونەی کە پارەیان نییە!

ئەگەر بابە نوێل بێتە ژووری نووستنەکەتان و یەك میلیۆن دۆلار لەسەر کورسیەکە دابنێت و بڕوات ئایا ئێوە ئەو پارەیە لەوێدا جێدەهێڵن یان بۆ نموونە لەژێر سەرینەکەتاندا دەیشارنەوە؟ نە! بێ گومان بەشێك لەم پارەیە دەگاتە نووسینگەی سەفەر و سیاحەتان، بەشێکی دیکە دەبێتە هی نوسینگەی ئۆتۆمبیل و ریستورانەکان، گوڵفرۆشی، جل‌وبەرگ فرۆش و تەنانەت دایرەی زەریبە و بەکورتی هەرکەس کە لە دەورتان دایە لەم پارەیە سوودێك دەبینێت. بەم حاڵەشەوە زۆرێك لە ئێمە بەم باوەڕەوە گەورە دەبین کە دەوڵەمەند بوون، کردەیەکی چاك نییە چونکە دەبینە هۆیەك بۆ بێبەش بوونی کەسانی دیکە. هیچ و پوچە! دەوڵەمەند بوونی هیچ کەس بەمانای ئازاری کەسانی دیکە نییە. بۆچی بەوجۆرە بیرنەکەینەوە کە بە سەرمایەکەی خۆمانەوە دەتوانین بارێك لەشانی خەڵکی سووك بکەین؟

## ڕێزی زۆر لەخۆتان بگرن

چ چیرۆکێکی سەیرە، ژیان. ئەگەر لە هەرشتێك، تەنها باشترینی قبوڵ بکەن، بەزۆری هەر ئەوەش بەدەست دێنن.

((سامرست موام))

ئەگەر دەتانەوێت کە دنیا، بەچاکی لەگەڵتان رابێت دەبێت لەگەڵ خۆتان، بەچاکی رابێن. چۆن دەتوانن هەستی مرۆڤێکی سەرکەوتووتان هەبێت کاتێك کە گۆرەویەکەتان کون کونە؟ یادگار دەڵێت: "کونی گۆرەویەکانم گرنگ نییە، خۆکەس نایبینێت." بەڵام خاڵەکە لێرەدایە. کەسانی دیکە گرنگ نین ئەو کەسەی کە دەبێت بیزانێت خودی خۆتانن و ئێوە تەنها کەسێکن کە دەتوانن هەستێکی تایبەت بە خۆتان ببەخشن. ئەگەر خودی ئێوە عزەت نەفستان نەبێت هیچ کەسێکی تر ناتوانێت پێتان بدات.

خانووەکەمان لەسەر جۆری هەستی ئێمە کاریگەری دائەنێت. دەوروبەری ژیانی خۆمان بە شێوەیەك درووست بکەین کە بە پیاسەکردن تێیدا هەست بە شادی و زەوق بکەین. کەسایەتی خۆمان بدەین بە خانووەکەمان پاك‌وخاوێنی، هیچ مەسرەفێکی نییە. ژیان کردن لە خانوویەکی بچوك و خاوێندا باشترە لە ژیان کردن لە کۆشکێکی پیس و شێواودا. ژنێك لە (جولی) هاوسەرم پرسیاری کردبوو: "بەم بیست دۆلارە کە بۆ دیکۆراتی خانووەکەم لەبەردەستم دایە، دەتوانم چ بکەم؟" وە (جول) وتبووی: "کاشی شۆرێك بکڕە!"

## لەوەی کە هەتانە چێژ ببەن

زۆرێك لە کەسەکان بۆ قاپی میوە، قاپە پلاستیکییە کۆنەکان بەکار دێنن لە حاڵێکدا کە قاپە جوان و تازەکانیان لە کەوانتەرە دەرگا بەستراوەکاندا، تۆز دەخۆن. بەڵام دواتر ئەوان دەمرن و هەموو ئەو قاپە کریستاڵانە بۆ منداڵەکانیان دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی بیانشکێنن! من دەڵێم، ئەگەر کریستاڵێکی جوانتان هەیە بۆچی خۆتان نایشکێنن؟

کەسێکم دەناسی کە ئۆتۆمبیلێکی (ڤۆڵڤۆ)ی نوێی کڕی بوو. ئەو بۆ نوێ هێشتنەوەی کورسیەکانی بڕێك رووکەشی کورسی بە کۆنەپەڕۆی نوێنەکانی درووست کردبوو، شێوە کردەوەیەکی چاك بوو بەڵام کێشەیەکی بچووکی بوو و ئەویش ئەوەی کە واهەستت دەکرد کە لە سەبەتەیەکی جلەکۆنەدا خەریك شۆفیریت!

من لەمبارەیەوە زۆرشت لە هاوسەرم (جول)ی فێربووم. فەلسەفەی ئەو ئەمەیە: "خۆت نازپەروەردە گەورە بکە، لەشت پەروەرش بدە و خانووەکەت خاوێن رابگرە بۆ ئەوەی لە ژیاندا هەست بە بەختەوەری بکەی." بە باوەڕی ئەو: "هەموو شتەکان لەسەر یەکتری کاریگەری دائەنێن. شێوەی رێگاکردنتان لەسەر شێوەی قسەکردنتان کاریگەری دائەنێت. جۆری جل‌وبەرگ لەبەر کردنتان لەسەر جۆری هەستتان کاریگەری دائەنێت. بایەخێك کە بە خۆتانی ئەدەن کاریگەری لەسەر بایەخ دانتان بەرامبەر بە خەڵکی هەیە."

رێز لەخۆتان بگرن. ئێوە دەڵێن: "رێز لەخۆ گرتن چ پەیوەندییەکی بە بەئاوت گەیشتن لە ژیاندا هەیە؟" پەیوەندی سەد لە سەدا! کاتێك

دەتوانین بەختەوەری بێنینە نێو ژیانی خۆمانەوە کە هەستی بەختەوەر بوونمان هەبێت.

یادگار دەڵێت: "کاتێک کە بە سەرکەوتوویی بگەم ئیتر وەکوو مرۆڤێکی بێ بایەخ و دوو روو ژیان ناکەم!" هەڵەیە! بۆ سەرکەوتوو بوون، دەبێ سەرەتا هەستی پێ بکەی.

## کورتەی وتە

لە باسی سەرمایەدا، بەپێویست باس لەسەر پارە نییە بەڵکوو باس لە شێوەی ژیانە.

## گرنگ نییە کە چ رووداوێک روونەدات، گرنگ ئەوەیە چۆن لێی بڕوانین

بەپێی حیکایەتێکی کۆن، کیمیازانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست خەڵکانێک بوون کە مسیان دەکردە ئاڵتوون، ئێستا من لەسەر ئەو بڕوایەم کە دەبێ هەموومان بەجۆرێک کیمیازان بین بۆئەوەی بتوانین لەنێو ئەم رووکەشە رواڵەتیەدا، قووڵایی ببینین. خەباتی ئێمە بەرامبەر بە ژیان دەبێت گۆڕانی شێوەی رووداوە دڵتەزێنەکان بۆ رووداوە پەسەندەکان بێت. "ئایا مانای ئەوەیە کە کاتێک قاچمان شکا تەنها دۆعا و پاڕانەوە؟" نە! بەڵام ئەگەر قاچتان شکا هەر لەکاتی ئەو بەڵا و کارەساتەدا بەدوی هەل و بارودۆخی نوێدا بگەڕێن. لەوانەیە پرسیار بکەن: "ئەم کارە چ سوودێکی بۆ من هەیە؟"

سوودی زۆر:

فێـری ئـەوە دەبـن بـەهۆی ئـەوەی لـە ژیانتانـدا تووشـتان بـووە، سوپاسگوزار بن.
بەم شێوازە لەجێی پاڵ پێوەنانی پاسی ژیان، سواری دەبن!
ئاسوودەتر و هێمنتر ژیان دەکەن.
ئەگەر فێربن کە لە بەرامبەر کارەساتە چاوەڕوان نەکراوەکاندا، تووشی ترسـەنۆکی نـەبن، تـەریبی و هاوکێـشی زۆرتـر وەدەسـت دێـنن و بـە جێگەی دەسەڵات دەگەن.

## ڕووداوەکان، بە پێی چاوەڕوانیەکانی ئێمە ڕوو ئەدەن

وایدانێن کە ئێوە ماوەیەکی کورتە کە لە هاوسەرەکەتان جیابوونەتەوە و ژیانتـان کـاولکراو وێنـا دەکـەن. تـا ئەو کاتـەی لەسـەر ئـەم بڕوایـە بن بەڕاسـتی هـەروا دەبێـت. وایـدانێن کـە لـە تەمـەنی ٥٠ سـاڵیدا لـە ئیش دەرکراون و وابیردەکەنەوە کە باشترین ساڵەکانی تەمـەنتان کۆتـایی پـێ هاتووە. تا ئەو کاتـەی لەسـەر ئـەم بڕوایـە بن ژیـانی ئێوەی هـیچ شتێك جیالەمە نابێت.
ئایا مەبەستی من ئەوەیە کە تا ئەو کاتەی کە ڕوانگـەتان نگـەتیڤ بێت، هـیچ کارێـك بـۆ باشـترکردنی ژیانتـان ئـەنجام نـادەن؟ لانیکـەم، بـەڵام کۆمەڵێك شتی دیکـەش هەیـە. تـا ئـەو کاتـەی کـە تـەنها چارەڕەشیەکان ببینن، کارەساتی زیـاتر بـەرەو لای خۆتـان ڕادەکێـشن: دەزگیرانەکـەتان جێتـان دەهێڵێـت، بەرپرسـەکەتان کێـشەتان بـۆ درووسـت دەکـات، ڕووداوەکـان بـەرەو ڕووتـان دێـن، خـاوەن ماڵەکـەتان جوابتـان دەکـات و ....

لەبیرتان بێت کە ڕووداوەکان بەپێی چاوەڕوان کردنەکانی ئێمە ڕوو ئەدەن.

جیاواز لەوەی کە باوەڕەکانمان سەبارەت بە مەسەلەیەك بگۆڕین، بیرکردنەوە نوێ کانمان، کەسان و هەلی نوێ بەرەو ژیانمان رادەکێشێت.

## کورتەی وتە

هیچ کارەساتێك لە ژیاندا ئەوەندە دڵتەزێن نییە. کارەساتەکان تەنها لەمەڕ گۆڕانی باوەڕەکانتان جێگایان لە ژیانتاندا خۆش کردووە. ئێوە دەڵێن: "بەڵام ئایا ئەمە سەبارەت بە نەخۆشی من، قەرزەکانم و مێردە بەردەوام سەرخۆشەکەشم راستە؟" گومانتان نەبێت!

## ژیان نابێت تا ئەم رادەیە سەیر بێت!

ژنێك بە منی وت: "من لە هەموو ژیانمدا هیچ ئیشێك کە حەزم لێی بووبێت، ئەنجام نەداوە." وەك ئەوە بوو کە بڵێت: "من لەناو چووم، من قوربانیم." وە من بیرم کردەوە: "چەندە ناخۆشە!" ژیان، بڕیارە کە جوان و سەرنج راکێش بێت! پەلەوەرەکان هەموو رۆژێك بەدەم خوێندنەوە وەخەبەر دێن. منداڵان بەبێ هیچ بیانوویەك پێدەکەنن. سەیری دولفین و سەگەکان بکەن. کێ وتوویەتی کە ژیان خاڵییە لە راکێشان؟ جیهان پڕە لە جوانی و خۆشی. ئەگەر ئێوەش هەڵگری ئەم باوەڕەن کە: "بڕیار نییە کە ژیان راکێشانی هەبێت"، لەمانای ئەم وتە بگەن. ئەمە بەتەنها باوەڕێکە کە ئێوە دەتوانن هەڵیوەشێنن.

ماوەیەك كات بۆ ئەنجام دانی كۆمەڵێك ئیشی تایبەت تەرخان بكەن تەنها لەبەرئەوەی ئەم ئیشانە سەرنجتان رادەكێشێت. ئیش كردنی شەووڕۆژی دەبێتە هۆی بەهێز بوونی ئەم بیرە كە "ژیان مشتومڕێكی بەردەوامە." لەگەڵ خۆتان بەسەبر بن. تەنانەت "چێژ وەرگرتن لە ژیان"یش پێویستی بە تەدریب هەیە. كاتێ كە ژیان شیرینە و دەنگێك بە ئێوە دەڵێت ئەم شیرینیە ناتوانێت بەردەوام بێت! بەخۆتان بڵێن: "لەوانەیە بڕیار وابێت كە لەمە شیرینتر بێت!"

ئەوکاتەی کە لە رادەبەدەر
هەڵواسراو دەبن،
هەموو شتێك وێران دەکەن!

خەباتی ژیان بەمانای
سوپاسگوزاری لە هەموو شتێك و پەیوەستەیی بە هەموو
شتێکەوەیە.

# بەشی چوارەم

## پەیوەستەیی و هەڵواسراوی

## پەیوەستەیی بە پارەوە

## لێبوردەیی

## پەیوەستەیی بە خۆشەویستەوە

### پەیوەستەیی و هەڵواسراوی

دواکەوتنی چنۆکانەی هەر شتێك بەمانای راونانی ئەو شتەیە. ئەوەندە بەسە کە دوای خۆشەویستەکەتان بکەن تا راوی بنێن. تەنانەت پارەش لەم رێسایە بێبەری نییە.

وایدانێن کە لە میوانیەك دا لەگەڵ کەسێك یەکتر دەناسن و ئەو دەڵێت کە حەوتووی داهاتوو پێوەندیتان پێوە دەکات. حەووتویەك وەیلان لەماڵ ناچنە دەرەوە و تەنانەت بۆ توالتیش ناڕۆن! لای تەلەفونەکە دائەنیشن... و چاوەڕێ دەکەن. کێ تەلەفون دەکات؟ هەموو کەس بێجگە لەو! ئایا هیچ کات پێویستی زەرورتان بە فرۆشتنی ئۆتۆمبیل، خانوو و ... بووە؟ چەند کەسی کڕیارتان پەیدا کردووە؟ هیچ. نرخەکانتان کەم کردۆتەوە. ئایا هیچ کەس بایەخی پێ دا؟ هیچ کات! بۆ لای هەر فرۆشیارێك بڕۆن جیا لەوەی کە تەیارە یان تایت بفرۆشێت،

هەر ئەم چیرۆکەی لێ دەبیستن. ناهۆمێدی مرۆڤ بەرەو گێژاوی لەناوچوون دەکێشێت و هەرچەندە نیگەرانتر بن، خەڵکی کەمتر دەکڕن. کاتێک کە لە ریستۆرانێک دانیشتوون و بۆ خواردن بەپەلەن چی روو ئەدات؟ راسپاردەکەتان ون دەبێت! خودی من یاسای پەیوەستەیی لە فەرۆکەخانەدا فێربووم. من بۆ ناساندنی کتێبەکانم سەفەری زۆرم بۆ شوێنە جیاوازەکانی جیهان ئەنجام داوە. ئەم سەفەرانە شەش حەوتوو تا چوار مانگی دەخایاند و تا ئەم دواییانەش لەبەر ئەوەی کە هاوسەرەکەم، جولی، سەرقاڵی ئیشی خۆی بوو، بەزۆری بە تەنها سەفەرم دەکرد، زۆربەی کات لە سەدجار نەوەدونۆی بەبێ ماتڵ بوون ئەنجام دەدرا، بەڵام ئەو یەکجارەی کە منی بە ماڵ و هاوسەرەکەم دەگەیاند هاوسەرێک کە بێتاقەت و نیگەرانی بووم بەردەوام بە چوار کاتژمێر ماتڵ بوونەوە بەڕێوە دەچوو!

لە کۆتایی دوایین سەفەرەم دا بۆ ئەمریکای باکوور، بڕیارمان دا کە لە سانفرانسیسکۆدا یەکتر ببینین. جولی لە ئوستترالیاوە گەیشتە سانفڕانسیسکۆ لە حاڵێکدا کە من هێشتا لە پورتلەند بووم. ئەم جۆرە دواکەوتنانە ئەوەندە لام ئاسایی بوو کە راستەوخۆ دەچووم بۆ بەشی پرسگە و پرسیارم دەکرد: "تەیارەی کاتژمێر شەش بۆ سانفرانسیسکۆ چەند کاتژمێر دوادەکەوێت؟" بەرپرسی بەشەکە دەیوت: "دواکەوتنی نییە!"

"دواکەوتنی نییە؟" ئەوەندە حەپەسا بووم کە ئەوەندەی نەمابوو خۆم هەڵدەمە سەر کورسیەکەی و لەباوەشی بگرم، بەڵام ئەو یەکسەر درێژەی بەقسەکەی دا و وتی: "ئەتەوێت بزانیت کە بۆچی دواناکەوێت؟ چونکە لەبنەڕەتدا هەڵوەشاوەتەوە!" کاتژمێر دەونیوی

ئەو بوو کە توانیم کورسیەك لە تەیارەیەك کە بۆ (سن خوزە) دەڕۆشت پەیدا بکەم و لەوێوە بە پاس بۆ سانفرانسیسکۆ بڕۆم و لەئەنجامدا کاتژمێر چواری بەیانی بگەمە هۆتێلەکەی جولی - حەوت کاتژمێر دواکەتن!

هەرکات بە ناهۆمێدیەوە تووشی مەسەلەیەك دەبین و یان پەیوەستەیی عاتیفی و بەهەستەوە بەرامبەر بە رووداوێك پەیدا دەکەین، دیوارێك لە بەرامبەریدا درووست دەکەین. بەڵام ئەو دیو پولەکە چیە؟ ئەگەر کەسێك ئارامی خۆی بپارێزێت هەموو شتێك چارەسەر دەبێت!

ماوەی ساڵێك و شەش مانگە هیچ هاوڕێیەکتان لەلا نەبووە و ئێستا ناهومێد و نیگەرانن. ماوەیەك تیپەڕ دەبێت و بێ خەیاڵ دەبن و بەخۆتان دەڵێن: "من پێویستم بە هاوڕێ نییە، بە تەنهاییش دەتوانم بەختەوەر بم." و لەناکاو سەروچاوی نوێ لە هەموو لایەکەوە دەردەکەوێت. لەوانەیە "موناقشە کردن" باشترین نموونە بێت لەم بوارەدا: کاتێ بڕیار ئەدەن باوەڕی کەسێك بگۆڕن چی روو ئەدات؟ ئایا باوەڕەکەی دەگۆڕێت؟ نە تا ئەو کاتەی کە ئێوە زیندوون. بەڵام ئەگەر زەختی لێنەکەن بەزۆری روو ئەدات کە ئەو خۆی بەرەو باوەڕەکانتان دێت. هەرکات نیگەران و چاوەڕوانی شتێکی بین بۆنموونە تەلەفونێکی تایبەتی، سەرکەوتن، سوپاسگوزاری بەرپرس و ..... لە دەوروبەری خۆماندا هێزێك درووست دەکەین کە ئەگەری روودانی ئەو شتە لەناو دەبات.

## نەبوونی پەیوەستەیی بەجێی هۆگرنەبوون

پەیوەستە نەبوون بە مانای هۆگربوون نییە. لەوانەیە بەرامبەر بە شتێك پەیوەستە نەبین و لەم حاڵەشدا زۆر هۆگری بین. مرۆڤە بەردەوام و ناپەیوەستەکان بەباشی دەزانن کە هەوڵ و چۆنیەتی، لەئەنجامدا بە پاداشت دەگات. ئەوان دەڵێین: "ئەگەر ئەمجارە براوە نەبم لەوانەیە جاری داهاتوو یان جاری دوای ئەوە بەتەئکید براوە دەبم."

وایدانێن کە خۆبەخشی وەرگرتنی ئیشێکی نوێ بوون. ئیشەکەتان خۆش دەوێت و ئامادەشن. ڕەشنووسی چاوپێکەوتنەکە دەنووسن و چەندجار لەبەر ئاوێنە تەدریب دەکەن. تەنانەت پێڵاوی نوێ لەپێ دەکەن و قژیشتان چاك دەکەن. پێش لە کاتی دیاریکراو دەگەنە شوێنی مەبەست و هەموو پرسیارەکان بە باشترین شێوە وەڵام ئەدەنەوە. دواتر چی؟ دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و ژیانی ئاسایی دەست پێدەکەنەوە. لە چەند خولی دیکە دا ناونوس دەکەن و بۆ چاوپێکەوتنەکانی دواتر خۆتان ئامادە دەکەن. ئەگەر لە کۆمپانیای یەکەم دا وەرگیران کە چ باشتر! بەڵام ئەگەر وەرنەگیران دووبارە ژیان لە ڕەوتی ئاسایی خۆی دا درێژەی هەیە.

ئەو مرۆڤانەی کە هۆگر نین، دەڵێن: "کێ بایەخ ئەدات؟"، "بۆچی خۆم تووشی زەحمەت بکەم؟" بێ هومێدەکان دەڵێن: "ئەگەر ئەو ئیشەم دەست نەکەوێت، دەمرم!" بەڵام ناپەیوەستە بەردەوامەکان دەڵێن: "بەهەر شێوازێك بێت ئیشێك پەیدا دەکەم و بۆشم گرنگ نییە کە ئەم مەسەلە چەندە کات دەخایەنێت."

## پەیوەستەیی بە پارە

"تەنها کەسانێك کە زیاتر لە دەوڵەمەندەکان بیر لە پارە دەکەنەوە هەژارەکانن.

((ئوسکار وایلد))

پەیوەستەیی، یان بەوتەی بوداکان "چنگ فرێدان" بە روونی پیشانی ئەدات کە بۆچی خەڵکی تا ئەم رادەیە لە هەوڵی وەدەستهێنان پارە دان. لەو بوارەوە کە پارە، ئامرازێکە بۆ مانەوە و هێمایەکیش بەنیشانەی سەرکەوتوویی، زۆربەی ئێمە زۆر پەیوەستەین بە پارەوە ئەگەر تەنانەت ئینکاریشی بکەین.

بەڵام بەداخەوە چنۆکی بۆ پارە پەیداکردن، هەموو شتێك لەناو دەبات. بەزۆری رووبەڕووی بوونەوەی عاتیفی لەگەڵ هەر شتێکدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەمتر زاڵ بین بەسەر ئەو شتەدا و چونکە زۆربەی مرۆڤەکان لە بەرامبەر پارەدا، زۆر عاتیفی هەڵس‌وکەوت دەکەن، ئاشکرایە کە هیچ کونترۆڵ و زاڵبوونێکیان بەسەرخۆدا نییە.

هۆکاری سەرەکی دەوڵەمەندتر بوونی دەوڵەمەندەکان، نەبوونی پەیوەستەیی ئەوانە بە پارەوە. ئەوان ئەوەندە بایەخ بە پارە نادەن. کاتێك کە پارەتان نییە سەرەتا دەبێت ئەوەندە ئاسوودە بن کە بتوانن وەدەستی بهێنن و کاتێك کە بەدەستتان هێنا ئەوەندە ئاسایی بن کە بتوانن بەشێکی بپارێزن و هاوکات باوەڕتان هەبێت کە پارەیەکی زۆرتر لەڕێ دایە. دەوڵەمەندەکان و هەژارەکان دوو روانگەی جیاوازیان بەرامبەر بە پارە هەیە. هەژارەکان ئاوات دەکەن کە پارەیەك وەدەست بهێنن و دەوڵەمەندەکان بەوەی ئیمانیان هەیە کە بەدەستی دێنن.

## چۆن دەتوانم هاوکات لەگەڵ ناهۆمێدی دا، لە ناهومێدبوون خۆ بپارێزم؟

قەت نەکەونە داوی وتنی ئەم دێڕە: "من بۆ بەختەوەر بوون پێویستم بە ..... هەیە." بەشێوەی گشتی بۆ ئەنجام دانی هەر ئیشێك، ئاسوودە بن! ئەگەر لەکاتی فرۆشتنی کەمپیوّتەردا، ئاواتەخوازی پلەیەکی بەرزتر یان چاوەڕێی تەلەفونێك دەکەن، ئەگەر بەدووی مێرددا دەگەڕێن یان چاوەڕێی وەرگرتنی فاکتۆر دەکەن، لەهەموو حاڵێکدا ئاسوودە بن! هەر کارێکتان بۆ دەکرێت بیکەن و دواتر بەخۆتان بڵێن: "من بۆ بەختەوەر بوون پێویستم بە .... نیە." لەبیری بکەن و درێژە بە رێگاکەتان بدەن. دەبینن کە لە زۆربەی مەسەلەکاندا ئەنجامی دڵویستی ئێوە روو ئەدات.

## کورتەی وتە

مرۆڤ لە ئاستەکانی جەستەیی و دەرونی دا لەگەڵ یاسا سروشتیەکان بەرەوڕووە. سروشت، ناهومێدی ناناسێت! سروشت لە گەڕان دایە بەدوی هاوسەنگی دا و ناهومێدی و هاوسەنگی قەت لە چوارچێوەیەکدا ناگونجێن. ژیان نابێت مشتومڕێکی بێکۆتایی بێت. بهێڵن هەر شتێك جووڵەی ئاسایی خۆی ببڕێت. ئەمە، بێ لایەنی نییە و ناچاری و زۆریش نییە. ئێوە دەتوانن بڵێن: " من تێناگەم کە ئەم بنەمایانە چۆن کار دەکەن!" بۆچی ئێوە دەزانن کە هێزی راکێشانی زەوی چۆن کار دەکات؟ ئەوەی کە ئێمە دەبێت لە ژیان دا ئەنجامی بدەین کەڵك وەرگرتنە لەم بنەمایانە. پێویست ناکات لێیان بگەین.

## بەخشین

ئەگەر شتێکت ئەتەوێت، ئەو شتە ببەخشە! گەوجانەیە، وانییە؟ بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە بۆ بەدەستهێنانی زیاتری هەر شتێك، دەبێ بەشێك لەو شتە ببەخشین. کەشاوەرزێك کە دانگەلێکی زیاتری دەوێت، دەبێ بەشێك لە دانەکانی خۆی بەزەوی ببەخشێت. کاتێ پێکەنینی کەسێکتان ئەوێت دەبێ پێکەنینی خۆتان هەدیە بکەن. ئەگەر عەشقتان دەوێت دەبێ عەشق بکەن. ئەگەر یارمەتی کەسانی دیکەتان دەوێت دەبێ یارمەتیان بدەن. ئەگەر ئەتانەوێت مشت بخۆن؟ دەبێ مشت لە کەسێك بدەن و ئەگەر ئەتانەوێت کە خەڵك پارەتان بدەنێ؟ بەشێك لە پارەکانتان بدەنی بە کەسانی تر.

لەمبارەیەوە بیر بکەنەوە. ئەگەر پەیوەستەیی هۆکارە بۆ دواکەوتنی رووداوەی چاکەکان لە ژیاندا دژی ئەم بابەتەش سەبارەت بە نەبوونی پەیوەستەیی درووست دەبێت و نەبوونی پەیوەستەیی بەمانای ئەوەیە کە بەشێك لەو شتانەی کە بۆمان گرنگن، ببەخشین. تەئکید بن هەر شتێك ببەخشن بەرەو لای ئێوە دەگەڕێتەوە.

کۆمەڵێ کەس بە من دەڵێن: "من هەموو ژیانم داوە و لەبەرامبەریدا هیچ شتێکم وەدەست نەهێناوە." من وانازانم کە ئەم جۆرە کەسانە هیچ شتێکیان بەخشیبێت ئەوانە دان وستانیان کردووە و ئەمە، زۆر جیاوازە.

ئەنجامی دەوڵەمەندە دەستکورتە پیرەکان کە قەت شتێکیان بەکەسێك نەبەخشیوە چییە؟ تا ئێستا چەند جار لەم چیرۆکانەتان بیستووە:

"پیرەپیاوێکی دەستکورتی دەڵەدز کە خواردنی نانی وشك بوو لە حاڵێکدا مرد کە یەك ملیۆن دۆلاری لە ژێر قەرەوێڵەکەیدا شاردبووەوە."
ئێستا ئەو پرسیارە گەلاڵە دەکرێت کە "ئەگەر وەدەستهێنانی پارە پێویستی بە بەخشین هەیە، ئەم پیرەپیاوە چۆن بێئەوەی بەخشینی هەبێت بەم سامانە گەشتووە؟"
مەسەلە لێرەدایە کە چەندایەتی حیسابی بانکی هیچ کەسێك پێوانەی رێژە و فراوانی ژیانی نییە. رێژە و فراوانی ئەو شتەیە کە لە جووڵەی ژیاندا دەسوڕێت. بەختەوەری و خۆشبەختی، جووڵەی هەتاهەتایی "بەخشین و وەدستهێنان"ە. ئەگەر لە بانکەکانی سویس دا، پارەیەکی زۆرتان هەبێت و کەڵکی لێ وەرنەگرن، ئەم سەرمایە قەت ئێوە دەوڵەمەند ناکات. بە بۆچوونی یاسایی، ئەم سەرمایە هی ئێوەیە بەلام حەقیقەت ئەوەیە کە ئێوە لە بەرامبەریدا هیچ شتێکتان دەست ناکەوێت و ئەم پارەیە، رێك وەك ئەوەی کە هی کەسێکی دیکە بێت، هیچ دەردێك لەئێوە دەرمان ناکات. کەوایە یاسای بەخشین و بەدەستهێنان تەنانەت لێرەشدا راستە.

## کورتەی وتە

رێگا و جۆری بەخشین، بەخشینی چاوەڕوان نەکراوە بۆ بەرامبەر. ئەگەر لە بەرامبەر ئەو شتەی کە دەیبەخشن چاوەڕوانیەکتان هەبێت

لەڕاستیدا پەیوەستەن بەو پاداشتەوە و کاتێک کە پەیوەستە بن ڕووداوێکی تایبەت ڕوو نادات.
ئایا دەبێ لە دارایی و سەرمایە مادییەکانی خۆمان چێژ ببەین؟ بێگومان! بەڵام سەرەتا قەناعەت بەوە بکەن کە ئێوە خاوەنی بن و نە بەپێچەوانەوە.

## پەیوەستەیی بە خۆشەویست

سەرچاوەی خەم و پەژارە، مەیلە.

((بودا))

ئەسرین بە ناهومێدی و بێقەرارییەوە بەدوی پیاوێکدا دەگەڕێت کە خۆشەویستی لەگەڵ و ستایشی بکات. ئایا هومێدێک بۆ دۆزینەوەی ئەم پیاوە ڕوو ئەدات؟ ئەوەندە نە. یەکەم ئەوەی کە بێقەراری ئەو هەموو پیاوەکان بەرەو دوا دەبات و دووهەم ئەسرین بە بێقراری و ناهومێدیەوە ناتوانێت کەسێکی دڵفڕێن بێت.
یادگار بە هاوسەرەکەی دەڵێت: "من پێویستم بە تۆ هەیە و بۆ تۆ ناتوانم ژیان بکەم." بەڵام ئەمە عەشق نییە، برسییەتیە. ئێوە ناتوانن لەیەك کاتدا کەسێکتان خۆش و بوێت و بێسەبەرانەش پێویستتان پێی هەبێت.
عاشقی حەقیقی کەسێکە کە خۆشەویستەکەی ئازاد بهێڵێت بۆئەوەی ڕەها بێت (خۆی بێت)، بۆ ئەوەی هەرچێك کە خۆی ئەیەوێت، بێت و

لەهەر کویٚ کەخۆی دیەویٚت. لە عەشقدا، ناچاری نییە. مانای عەشق ئیجازە دانە بە هەڵبـژاردنی خۆشەویـست. لیٚرەشدا باس لە نەبوونی پەیوەستەییە. بۆ ئەوەی کەسیٚك یان شتیٚك بەدەست بهیٚنیت، رەهای بکە.

## پەیوەستەیی و رق

تاکاتیٚك کە شتیٚك قبولٚ نەکەین ناتوانین بیگۆڕین.

((کارل یونگ))

رق، شتیٚکی باش نییە. کاتیٚك رقمان لە شتیٚك بیٚت بە شیٚوەیەی نادیار پەیوەنـدیمان پیٚـوە دەبیٚـت و ئـەم پەیوەندییـە، دەبیٚتـە هـۆی مانـەوەی بابەتی رق لیٚ بوون.

نموونە: وایدانیٚن کە قەرزارن و رەقتانە لە قەرزاری. بـەم هەلومەرجەوە باشتر کردنـی بـاری ئـابوری، کاریٚکـی ئاسان نییـە. ئیٚـوە وزەیـەکی زۆر سـەرف نیـشاندانی رق لـە قـەرزاری دەکـەن: "من لەجیٚدا دەکوتم"، "من خنکاوم" و .... بەلاٚم ریٚگای چوونە دەرەوە لـە قـەرز و قـەرزاری ئەوەیە کـە حەقیقـەت قبـولٚ بکـەین و بـەبیٚ ئـاژاوە و نیگـەرانی، ریٚگایـەك بـۆ چـوونەدەرەوە بدۆزینـەوە. قبـولٚ کردنـی حەقیقـەتی هـەبوو ب مانـای "تەسلیم بوون" نییە بەڵکوو بە مانای تیٚگەیشتنە لە حەقیقەت.

نموونـە: تـا ئـەو کاتـەی کـە قەڵـەو بوونمـان وەکـوو حەقیقـەتیٚك قبـولٚ ناکـەین یـان بـەزۆری قەڵـەو بوونمـان ئینکـار دەکـەین و یـان ئـەوەی کە

بەهۆی قەڵەو بوونمانەوە خۆمان لۆمە دەکەین. وە لە هەردوو حاڵەتدا، قەڵەو دەمێنینەوە. کەم کردنەوەی کێش لە کاتێکەوە دەست پێدەکات کە قەڵەوی خۆمان قبوڵ کردبێت.

بە تووڕە بوون و شەڕ کردن، هیچتان بۆ ناکرێت. بۆ زاڵ بوون بەسەر شتێکدا کە خۆشتان ناوێت، سەرەتا دەبێ لەجێی خۆڕاگری کردن، قبوڵی بکەن و ئەوجار شتێکی پۆزەتیڤ لەجێی دابنێن.

**بیر لە هەرچی بکەنەوە**
**بەرینی دەکەن......**
**کەوایە**
**بەو شتەی کە دڵویستی ئێوەیە، بیربکەنەوە.**

# بەشی پێنجەم

## بۆچی پۆزەتیڤ بیربکەینەوە؟

## بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ چۆن شێوەبەزەمیری بێئاگای ئێوە ئەدات؟

## بەرهەمی بیرکردنەوە، بەدەستهێنانی ئەنجامە.

### بۆچی پۆزەتیڤ بیربکەینەوە؟

واوێنا بکەن کە سواری جیمبۆجێتن و لەسەر ئاسمانی ئەوروپا لەفڕین دان کە لەناکاو یەکێك لە مەکینەکان لە باڵەکە دەکنرێتەوە و دادەکەوێت. حەزدەکەن فڕۆکەوان چ دژکردنەوەیەکی هەبێت؟ حەزدەکەن بڵێت: "ئارام بن و پشتێنی نەجات ببەستن! ئێمە هاوسەنگی خۆمان لەدەست داوە بەڵام بێگومان ڕێگایەك بۆ نشتنەوە پەیدا دەکەین؟" یان ئەتانەوێت فڕۆکەوان بە پەشۆکاوییەوە بێت، و هاوار بکات: "هەموومان دەکوژرێین! هەموومان دەکوژرێین! بەڕای ئێوە کامەیان دەتوانێت ئێوە بە سەلامەتی لەسەر زەوی بنیشێنێتەوە؟

ئێستا بیر لە ژیانی ڕۆژانەی خۆتان بکەنەوە، شوێنێك کە خودی خۆتانی شۆفێرن. بەکامە ڕووبەڕوو بوونەوەوە لەچارەسەر کردنی کێشەکانتاندا

سەرکەوتوو دەبن: "بێگومان ڕێگایەك پەیدا دەکەین" یان "هەموومان دەکوژرێین؟" ئەمە گرنگترین تایبەتمەندی پۆزەتیڤی تێفکرینە. تێفکرینی پۆزەتیڤ، هیچ گەرەنتیەك بە ئێوە نادات بەڵام هەلومەرجێك دەرەخسێنێت کە لە ئەوپەڕ توانای خۆتان کەڵك وەربگرن.

تەرکیز کردنی دۆڕاوەکان بەردەوام لەسەر "هەرگیزنابێت"ە بەڵام ئەوەی پۆزەتیڤ بیردەکاتەوە بە "بوون" تێدەفکرێت و بە تەرکیز کردن لەسەر "بوون"ەکانە کە هەر شتێك بە حەقیقەت دەگەیەنێت.

## بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ چۆن شێوە بە زەمیری بێئاگای ئێوە ئەدات؟

زەمیری بێئگای ئێمە، کۆکراوەیەکە لە هەموو بیرکردنەوەکانی ئێمە و باوترین بیرکردنەوەکانی ئێمە، بەهێزترین هەڵسوکەوتە بێئاگاکانی ئێمە بەرهەم دێنێت.

بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە "بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ" سەرەتا پێوستە زەمیری ناهوشیار بناسین: وێنا یبکەن کە مێشکی ئێوە وەکوو گوێزێکی گەورە دابەش کراوە بەدوو کەرتی سەرووەوە و ژێرەوە. بەشی سەرەوە کە لەڕاستیدا زەمیری هوشیاری ئێوەیە لە بیرکردنەوە و تێڕوانینەکانتانی ڕۆژانەتان پێکهاتووە و کەرتی ژێرەوە هەر ئەو زەمیرە ناهوشیارەیە. زەمیری ناهۆشیاری مرۆڤیش پێکهاتووە لە ئەو بەرنامانەی کە لە سەرەتای لەدایکبوونەوە لەگەڵیدا بوون، وەکوو هەناسەدان و خواردن و کۆمەڵێك بەرنامەی دیکە کە لە لایەن خودی کەسەکەوە درووست کراون وەکوو بەڕێگا ڕۆیشتن و قسەکردن.

ئێستا وایدانێن کە ئەتانەوێت فێری شۆفیری بن. هەرکات لە تاسەیەک نزیک دەبنەوە بیرێکی هوشیارانە لە بەشی سەروەی مێشکدا ئەکتیڤ دەبێت: "قاچی راستت بەرز بکەرەوە و بەهێواشی بەرەو لای چەپ ١٢ س بیجووڵێنە و قاچت لەسەر ستۆپ دانێ." بە دووپات کردنەوەی ئەم بیرە هوشیارانە دوای ماوەی چەند مانگ بەرنامەیەکی ئۆتۆماتیک لە مێشکی ئێوەدا دروست دەبێت کە توانای ئەوە بە ئێوە ئەدات کە بەبێ بیرکردنەوە، ستۆپ بکەن. بەرنامەی ستۆپ کردن لە بەشی ژێرەوەی مێشکی ئێوەدا واتە زەمیری ناهوشیار ریشەی داکوتاوە و ئێستا ئێوە بەرنامەیەکی ناهوشیاری نوێتان هەیە.

بەمشێوەیەیە کە شۆفیرە بەئەزمونەکان، ماوەی چەندین کاتژمێر شۆفیری دەکەن و کاتێ دەگەنە شوێنی مەبەست لە بنەڕەتدا شۆفیری وەبیرناهێننەوە. هۆکار ئەوەیە کە زەمیری ناهوشیار هەموو ئیشەکانی ئەنجام داوە. هەموو بیرێکی هوشیارانە بەهۆی دووپات بوونەوەوە لە ماوەیەکد دەبێتە بەرنامەیەک.

ئێستا وایدانێن کە ئێوە بیرکردنەوەیەکی هوشیارانە وەکوو "من بەردەوام ئیفلاسم"تان لە ماوەی چەندین ساڵدا لە مێشکتاندا دووپات کردبێتەوە. ئایا دەزانن کە چیتان کردووە؟ ئێوە بەرنامەیەکی ئۆتۆماتیکیتان لە مێشکتاندا دروست کردووە کە تەنانەت بەبێ پێویستی بە بیرکردنەوەی ئێوە، ئیشەکەی خۆی ئەنجام ئەدات. بەواتایەکی دیکە، بەبێ بچووکترین هەوڵێکی هوشیارانە، خۆتان ئیفلاس کردووە. ئێستا ئەم مەسەلەیە چۆن لەگەڵ بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ رێدەکەوێت؟ ئاسانە. لە مێشکی مرۆڤدا رۆژانە نزیکەی پەنجاهەزار بیر گوزەر دەکات و سەبارەت بە زۆربەی مرۆڤەکان ئەم

بیرکردنەوانـە، بـەزۆری بیرکردنـەوەی نگـەتیڤن: "خەریکـە قەڵـەو دەبم! مێشکم لاوازە. ناتوانم قەرزەکانم بدەمـەوە! هـیچ ئیشێك لـە ژیانی منـدا بەباشـی بەڕێوەناچێت." بـەم بیرکردنـەوە نگەتیڤانـەوە، چاوەڕوانی چ هەڵس‌وکـەوتێکی ناهوشـیار دەکـەین؟ زۆر ئاشـکرایە: هەڵس‌وکـەوتی نگەتیڤ، ئەو هەڵس‌وکەوتانەی کە ژیان و تەندروسـتی ئێمـە، تەنانەت بەبێ ئەوەی بیرمان لێ کردبێتەوە بەرەو لەناوچوون دەبات.

خەڵکی بەسەر سوڕمانەوە پرسیار دەکەن کە بۆچی دەبێ ئیشی ئێمە بە ئیفلاس بوون کۆتایی پێ بێت وە بەڕاسـتی نازانن کە خـودی ئەوان بە دووپـات کردنـەوەی بیرکردنـەوە روخێنـەرەکانیان هۆکـاری بـەدەختی خۆیـانن. ڕێـك وەك ئـەوەی کـە دەتـوانین خۆمـان بـۆ شـۆفێری بـێ بیرکردنەوە بەرنامەڕیزی بکەین، دەشتوانین بەرنامە بەخۆمان بدەین کە بـەپێی ئەوانـە و بـەبێ پێویـستی بـە بیرکردنـەوەی دووبـارە، بـەردەوام دوابکەوین، بەردەوام ئیفلاس بین، بەردەوام بە بەدبەختی و نەبوونیەوە ژیـان بکـەین و ... دواتـر دائەنیـشین و هـەموو ئەمانـە بە چارەنووس و خوا دەزانین.

بەڵام بەشی سەرنج ڕاکێشی ڕووداوەکە لێرە دایە. بەپێی ئەو ناسینەی کە لە چاولێکردنەکانی زەمیری هوشیار وەدەستان هێناوە، ئێستا ئیتر ناچارنین کە دۆڕاو بمێننەوە. داهـاتووی ئێـوە بەسـتراوە بە بیرکردنەوە هۆشـیارەکانتانەوە. کـاتێ بەسـەر مێـشکتاندا زاڵ بـن و بیرکردنـەوەی هوشـیار بێننـە ژێـر ڕکێفـی خۆتـان بەرنامـە ناهوشـیارە دڵویستەکانی خۆتـان درووسـت دەکـەن. ڕێـك وەك ئەوەی کە دەتـوانن هەڵس‌وکـەوتی ناهوشـیاری "شـۆفێر"ی لـە خۆتانـدا دروست بکـەن ئاوەهـاش دەتـوانن

هەڵس‌وکەوتی ناهوشیار بۆ "سەکەوتووتر ژیان" دروست بکەن. بەڵام پێویستی ئەم کارە، بیرکردنەوەی نەزم پێدراوە ... وە ماوەیەك کات.

ئێستا یادگار لەبەرچاو بگرن کە پاش وتارخوێنیەکی بەهێز، خۆی ئامادەی پۆزەتیڤ بیرکردنەوە کردووە. یادگار دەڵێت: "من دەمەوێت ژیانم بگۆڕم!" ئەو بەرلە نانی بەیانی ئامانجەکانی لەسەر کاغەز دەنووسێت... "چوونەسەرەوەی پلە وپایە، کڕینی رۆیزلرۆیز، کڕینی ...." دەکاتە بیرکردنەوەی رووخێنەر وئاسایی خۆی. لەکۆتایی حەوتوودا یادگار دەڵێت: "واهەست ناکەم کە بەم بیرکردنەوە پۆزەتیڤەوە هیچ شتێك بەرەوپێش ببەم!"

لەوانەی یادگار لە چل‌وهەشت هەزار بیرکردنەوەی نیگەتیڤی رۆژانە گەیشتبێتە چل‌وحەوت هەزار پێنسەد بیرکردنەوەی نگەتیڤ، بەلام ئەو چاوەڕوان دەکات بەم گەشە کردنە هەست پێنەکراوەوە لە بلیت شانسدا براوە بێت، نەخۆشیەکەی چاك بێتەوە و شەڕ و مەرافیعەی ماڵەوەی کۆتایی پێ بێت. بەیەك رۆژ بیرکردنەوەی نگەتیڤ، ناتوانین چاوەڕوانی موعجیزە بکەین. پەروەردە کردنی مێشك وەکوو پەروەردە کردنی جەستەیە. بە بیست جار "هەڵسەودانیشتە" و هەڵهاتن بۆ بەر ئاوێنە هیچ گۆڕانێك لە بارودۆخی جەستەیی خۆتاندا نابینن. هەربەمشێوەش بە بیست‌وچوار کاتژمێر بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ، هیچ گۆڕانێك لە ئێوەدا دروست نابێت. بەڵام ئەگەر بتوانن بۆ ماوەی چەند مانگ ئەم رەوتە درێژە بدەن، ئاگاداری گۆڕانی گەورە لە ژیانتاندا دەبن. خاوێنکردنەوەی مێشك لە بیرکردنەوە نگەتیڤەکان، کارێکی گەورەیە کە لە هەموو تەمەندا دەبێ خەریکی بین. وە ئەم ئەرکێکی دژوارە چونکە

بەزۆری لە قەیرانی بیرکردنەوە نگەتیڤەکانیشدا نازانین کە تووشی ئەم بیرکردنەوانەین.

ئەگەر ئەتانەوێت بیرکردنەوەی خۆتان میراتی بکەنەوە سەیرێکی ژیانتان بکەن. دارایی و سامان و بەختەوەری، چۆنیەتی هەڵس‌وکەوتتان بەرامبەر بە خەڵکی و تەنانەت تەندروستیتان، ئاوێنەی باوترین بیرکردنەوە هوشیارەکانی ئێوەیە.

## بەرهەمی بیرکردنەوە، بەدەستهێنانی ئەنجامە

ئەگەر شتێك لە ژیانی ئێوە دایە کە ناتانەوێت، وازلە نیگەرانەکانتان بهێنن و ئیتر باسی مەکەن! لەبەر ئەوەی ئەو وزەیەی کە لەم نیگەرانیانەدا سەرفی دەکەن دەبێتە هۆکارێك بۆ مانەوەی ئەم بابەتە.

ئەگەر هاوسەرەکەتان بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و بەدوی بیانوویەکدا بگەڕێت بۆ موناقشەکردن و ئێوە خۆتانی لیّ لابدەن، چی روو ئەدات؟ ئەو ناتوانێت بەتەنهایی شەڕ بکات!

هەرکات نیگەرانی مەسەلەیەك ببن و تەنانەت بیریشی لیّ بکەنەوە، خەڵکانی تر بەبیّ هیچ شتێك و وەستانێك سەبارەت بەهەر ئەو بابەتە قسە دەکەن. ئەم بابەتە لەسەردەمی منداڵی زۆر سەرنجی منی راکێشابوو. هیچکات نەمدەتوانی تێبگەم لەوەی کە هەر کات من جگەرەکانی باوکم دەکێشا بۆچی دایکم کاتی نووستن منی ماچ دەکرد!

ئەگەر ئەتانەوێت نیگەرانیەکانت بەبا و لەناو بچن بەڕاستی و لەقولایی دڵەوە بیّ خەیاڵ بەپیشەتان بکەن. ئەم بابەتە، ئێمە بەرەو بنەمایەکی دیکە رێنوێنی دەکات....

## کاتێك بەرامبەر بە مەسـەلەیەك بـێ خـەیاڵ دەبـن و وازی لێدێنن ئەو مەسەلەش واز لە ئێوە دێنێت.

کاتێك کە لە حاڵەتی بەرگری دان خەڵکی هێرش دەکەن. بۆچی؟ چونکە ئێمە تنها کاتێك بەرگری دەکەین کە لە پلە و شوێنی خۆمان گومانمان هەبێت. بەڕاستی!

نمونـە – وایـدانێن هاوسـێکەتان تۆمـەتی کەوکـەبی بـوونی خـستۆتە پاڵتان. ئایا ئێوە شڵەژاو و بەپەلە سەبارەت بە گیانلەبەرە ئاسمانیـەکان لەگەڵ ئەودا موناقشە دەکەن؟ نە. ئێوە دەزانن کە کەوکـەبی نـین کەوایـە لەوانەیە بەس پێی پێبکەن.

نمونە – وایدانێن کە لە فەرمانگەکەی ئێوەدا پروپاگەندەی بێ ئەساس دژ بە ئێوە بلاوبووەتەوە.

ئەگـەر ئێـوە بـۆ سـەلماندنی بـێ تـاوانی خۆتـان وتـارخوێنی بـۆ هاوکارەکانتان رێبخەن، ئەم ئاورە گەشتر دەکەنەوە. رێگای ئەوەیە کە هـەموو شـتەکان بـە نەبیـستراو بـزانن. دەبیـنن کـە هـەموو شـتەکان زۆر بەزوویی لـەبیر دەکرێت. ئایـا قسەی مـن ئەوەیـە کـە داکـۆکی لـەخۆتان مەکـەن؟ نـە! مـن دەڵـێم چـونکە خۆمـان دەخـۆینـەوە و رەخنـە دەگـرین و هات و هاوار دەکەین، مەسەلەکە تازە دەهێڵنەوە.

لەبیرم دێ کە لە یـەکێك لـە رۆژەکـانی دەیـەی ١٩٦٠ دا لـە تەلەفزیۆنەوە سـەیری خۆپیـشاندانەکانی خـەڵکم دەکـرد. پرسـیارم لـە بـاوکم کـرد: "بۆچی ئـەم خەڵکـە بـە مـشت وشـەق بەربوونەتـە یـەکتری؟ " وە بـاوکم وتی: "بۆ ئەوەی داوای ئاشتی دەکەن!"

بۆ ئاشتی شەڕ مەکەن، بۆ ئاشتی، لەسەر ئاشتی تەرکیز بکەن.

## کورتەی وتە

ئەگەر ژیانی خۆتان بکەن بە بەرەیەکی یەکگرتوو بەرامبەر بە جیهان، هەر شتێك کە لە بەرامبەر خۆتان داتانناوە، گەورە و گەورەتری دەکەن.

## ئێمە بڕیار ئەدەین کە چۆن سەیری خەڵکی بکەین

یادگار و سارا بۆ یەکەمجار پاش بەیەك گەشتنیان(زەواج) خواردنی ئێوارە لە ریستورانێك دەخۆن. یادگار پێداگرە بۆ تێپەڕ کردنی کاتێکی خۆش، سارا زەلاتەکە دەڕژێنێتە سەر جلەکانی و یادگار دەڵێت: "بهێڵە یارمەتیت بدەم خاوێنی بکەیتەوە،" سارا کلیلیماڵەوە ون دەکات و یادگار دەڵێت: ئەمە ئیشی هەموو رۆژێکی منە!"

پاش سێ ساڵ یادگار و سارا بۆ خواردنی ئێوارە دەچن بۆ ریستورانێك و یادگار دەڵێت: "تۆ تەحەمول ناکرێیت!" سارا کلیلی ماڵەوە ون دەکات و یادگار دەڵێت: " ئای کە بێ مێشکی!"

مرۆڤەکان وەك یەك، بارودۆخ هەمان بارودۆخ، روانگەی جیاواز! ئێمە بڕیار ئەدەین کە چۆن سەیری خەڵکی بکەین. کاتێك ئەمانەوێت کەسێکمان خۆش بوێت دەتوانین زۆر بەسەبر و بەتەحەمول بین و کاتێك بڕیار ئەدەین کە لە کەسەکان دڵنیگەران بین لە هەڵەکانیان ورد دەبینەوە. جۆری هەستێك کە بەرامبەر بە خەڵکی هەمانە پەیوەست نییە بە شێوە هەڵسوکەوتی ئەوانەوە بەڵکوو پەیوەندی بە روانگەی خۆمان هەیە. زۆربەی کەسەکان، زۆرترین کاتی خۆیان بۆ دۆزینەوەی

عەیبی خەڵکی دیکە تەرخان دەکەن و کەمتر سەرنج ئەدەنە چاکی ئەوان. سارا دوو پێرستی جیاوازی سەبارەت بە تایبەتمەندیەکانی یادگار ئامادە کردووە. لە پێرستی کورتی یەکەم دا، ئەو بەنیشانی هاوسەر بوونی یادگار، بەکورتی گەڕاوە بۆ عەیبەکانی و لە پێرستی دووهەم دا، بەنیشانەی بێوەژن بوونی، باسی لە تایبەتمەندی و خووە چاکەکانی یادگار دەکات، تایبەتمەندیگەلێك وەکوو: دەست ئاوەڵایی، میهرەبانی، گاڵتەجاڕی و .....بەڵام سەیر لێرەدایە کە هەموو کاتی سارا لەسەردەمی ژن و مێردی دا، سەرقی پێرستی کورت کراوە، وەکوو نمونە ئەو خاڵە کەمانەی کە هۆکاری ئازاردانی سارا بووە..." یادگار هەموو رۆژنامەکان لەسەر مێزی خواردن بڵاودەکاتەوە" ، "یادگار دەرگای توالیت داناخات" و ... تا ئەوەی کە یادگاری چارەڕەش رۆژێك سەیارە لێی ئەدات. نیوەی شەو سارا دەڕواتە سەر پێرستە کورتەکە... "یادگار فریشتە بوو... میهرەبان، دەست ئاوەڵا، ماندوونەناس.... ئەو باشترین مێردی سەرزەوی بوو."

ئەگەر وابڕیارە کە ئەم پێرستانەمان هەبێت لانیکەم وابشتر نییە کە لە تایبەتمەندییە چاك و پۆزەتیڤەکانەوە دەست پیێ بکەین؟

ئایا دەتوانرێت لەسەر چاکی خەڵك تەرکیز بکرێت و کاتی مردنیان بەمجۆرە لەگەڵ خۆ بدوێین: "گرنگ نییە، ئەو زۆر وڕەوڕی دەکرد؟"

ئەگەر داوا لەئێوە بکەم کە عەیبەکانی دایکتان بڵێن ئایا شتێك بۆ باسکردن نادۆزنەوە؟

ئەگەر بڵێم: "پێنج خاڵ لەو خاڵانەی کە پەیوەندیان بەڕوالەت، روانگە و هەڵسوکەوتی ئەوەوە هەیە و پەسەندی ناکەن، ناو بهێنن"، ئایا دەتوانن ئەم خاڵانە بدۆزنەوە؟ گرەو دەکەم کە دەتوانن. لەڕاستیدا

ئەگەر کاتتان هەبێت دەتوانن سەد و یان تەنانەت هەزارن عەیبیش ناوبەرن و لەوانەشە وایلێبێت بە ئەنجامێك بگەن کە ئامادەی بینینی دایکتان نەبن!
ئەو کەسانەی کە تەرکیز لەسەر خاڵە نگەتیڤەکان دەکەنەوە بەزۆری بەم دێڕە داکۆکی لەخۆیان دەکەن: "من تەنها واقیعانە سەیر دەکەم." بەڵام راستی ئەوەیە کە هەرکەس داهێنەری واقیعەکانی خۆیەتی. ئەمە ئێوە کە بڕیار دەدن دایك و یان هەرکەسێکی دیکەش بە چ شێوەیەك سەیر بکەن. لە کەسانی دەوروبەر کەسێك هەڵبژێرن و لەسەر ئەو تایبەتمەندییە پۆزەتیڤانەی کە پەسەندی دەکەن، ورد ببنەوە و ئاگادار بن کە چۆن پەیوەندیتان رووڵەباشتر بوون دەبێت. ئەم شێوەیە، لە بڕێك مەسەلەدا دەتوانێت دژوار یان تەنانەت ترسێنەر بێت بەڵام کاریگەرە.

## سوپاسگوزاری و شوکرانەبژێری بەخشراوە

"مرۆڤێکی ناسوپاسگوزاری بەختەوەرم پیشان بدە!"

((زیگ زیگلێر))

هەموو فێرکاریە ئاینیەکان، ئێمە بۆ سوپاسگوزاری هان ئەدەن. یادگار دەڵێت: "بۆچی دەبێ هەموو تەمەنم سەرف رازی کردنی خواوەند بکەم؟" ئەوەی راستی بێت من گومانم هەیە کە خوا پێویستی بەم شتانە هەبێت. کەسێك کە دەتوانێت کێوەکان بجووڵێنێت و کاکێشانەکان دروست بکات، ئەدی پێویستی بە سەلماندنی هیچ شتێك نییە!

سوپاسگوزاری ئێمە، تەنها بۆخۆمانە و هۆکارەکەی ئەمەیە کە ئێمە لە ژیاندا ئەو شتە بەدەست دەهێنین کە کاتی بۆ دائەنێین. کاتێك لەمەڕ ئەو شتانەی پێمان دراوە سوپاسگوزاری دەکەین هەست بە پڕتربوون دەکەین و هەر ئەم هەستەیە کە شتی زۆرتر و بەخشراوەی چاکتر دەهێنێتە ژیانی ئێمەوە.

کاتێك لەگەڵ هاوسەرم، جولی، یەکترمان ناسی ئاگاداری ئەم خاڵە بووم کە ئەو جیالە هەموو تایبەتمەندییە جوانەکانی، ناتەواوییەکیشی هەیە: حەسێب و کتێب کردن نازانێت! بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە ئەو قەت نازانێت کە چەندی پارە پەیدا کردووە، چەند پارەی وەرگرتووە و چەندی خەرج کردووە، بەردەوام بەختەوەر و بەختیار بووە. ژیانی جولی نموونەی زیندووی ئەم وتەیە: "تا کاتێك کە باس لە چۆنیەتیەکانی ژیانە، بوونی هەستێکی سوپاسگوزار و باوەڕ بە بەخششی خواوەند، زۆر گرنگتر لە مەنتق و بیرکارییە."



Scanned by CamScanner

گوێڕایەڵی دڵتان بن.

ڕاسپاردەی ئێوە لە ژیاندا
"بێ کێشە ژیان" نییە
"بە ئامانجەوە ژیان"ە.

## بەشی شەشەم

## ئیشێك بكەن كە خۆشتان دەوێت

## ژیانی كاریتان

## سەمتی خۆتان بگۆڕن

## بیانووی ئێوە چییە؟

### ئیشێك بكەن كە خۆشتان دەوێت.

لەم بەشەدا دوو زەمینەی بنەڕەتی بوونی هەیە:

١- ئێوە جۆری روانین و روانگەی خۆتان بەرامبەر بە ژیان، هەڵدەبژێن كە ئەگەر ئاوەها بكەن بەزۆری لە هەر ئیشێك چێژدەبەن.

٢- ئەگەر لە زەمینەی دڵویستی خۆتاندا ئیش بكەن شادمانتر دەژین، ئەگەر سەركەوتنتان زیاتر دەبێت و لەوانەیە پارەیەكی زیاتر بەدەست بهێنن.

كەوایە من سەرەتا دەڵێم: "بڕیار بدەن لەسەر هەر ئێشێك كە ئێستا ئەنجامی ئەدەن خۆشتان بوێت" و دواتر دەڵێم: "پێڕەوی دڵتان بن." ئایا لەنوێن ئەم دوو وتەیەدا دژایەتیەك هەیە؟ نە. سەرەتا لە كەمترین

ماوەدا ئێمە دەبێت باشترین کەڵك لە هەلومەرجەکان بگرین. بۆ نمونە ئەگەر پێویستمان بەپارە هەیە دەبێ سەرەتا ئیشەکەی خۆمان بهێڵینەوە و هەرلەم کاتەدا بۆ داهاتوو بەرنامە دابنێین. بەلام لە درێژماوەدا، تەنها بە ئەنجام دانی ئەو ئیشەی کە خۆشمان دەوێت دەتوانین خۆمان لە خۆمان رازی بین و مێشکمان ئاسوودە بێت.

## ئیشی پەسەند

بەزۆری واهەست دەکرێت کە ئیشی خەڵکی لە هی ئێمە سەرنج راکێشتر و ئاسانتر و پڕداهاتترە! پەرستارەکان وادەزانن کە ئیشی دوکتورەکان ئاسانترە. فرۆشیارەکان بەغیلی بە مودیرەکانیان دەبەن و هەموو وایوێنا دەکەن کە ئیشی سیاسەتمەدارەکان لە هی هەمووی ئاسانترە. بەلام لە کۆتایی دا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە هیچ ئیشێکی پەسەند بوونی نییە. بۆچی؟! وەلام روون و ئاشکرایە، کەسانی دیکە مانگانەمان پێ ئەدەن بۆ ئەوەی ئیشێك بکەین کە خۆیان ناتوانن یان نایانەوێت بیکەن. ئەگەر کێشەیەك بۆ چارەسەر کردنی نەبوونی ئیش بۆ ئێمە بوونی نەدەبوو. ئەگەر ئیشەکەتان خۆش ناوێت دوو رێگا لەبەردەمتان دایە: یان روانگەی خۆتان بگۆڕن وە یان ئیشەکەتان.

ئێمە لە خەیاڵی خۆماندا دەڵێین: ئەگەر ئیشێکی ئاسانترم دەبوو، بەختەوەر بووم" بەلام لە دنیای راستیەکاندا، هیچ کەس ئیشی ئاسانی خۆش ناوێت. لەڕاستیدا کاتێك کە ئیشێك لەرادەبەدەر ئاسان دەبێت، بەزۆری وازی لێدەهێنین! مرۆڤ بەچەشنێك تینوی خەباتە کە کاتی

فەراغیش بەدووی دا دەڕوات. بەڕاست بۆچی یاری گوڵف ئەوەندە لایەنگری هەیە؟ بۆ بانگەوازی مرۆڤ دەکات بۆ خەبات.

یادگار دەڵێت: "ئەگەر بتوانم ئیشێك بۆ خۆم پەیدا بکەم کە کۆن و دووپاتی تێدا نەبێت ئەو کات هەست بە بەختەوەری دەکەم!" بەڵام زۆربەی ئیشەکان دووبارە و تازەگەری تێدا نییە. سکرتێرەیەك بەردەوام ناچارە کە نامە تایپ بکات و ئەکتەرێکیش بەبێ وەستان فلیم دەربکات. هەرهەمووی دوپات بوونەوە و دووپات بوونەوە!

هەڵەی ئێمە لەوە دایە کە ژیانمان بەسەر دووبەشی ئیش و فەراغ دا دابەش کردووە، ئەم مۆرکانە لەسەر کاتژمێرەکانی ژیان هۆکارێکە بۆ بەرتەسك بوونەوەی ئێمە. لەڕاستیدا ئێمە بەخۆ دەڵێین: "لەئێستاوە تا کاتژمێر پێنج لەسەر ئیشم و دەبێ ئەم ئازارە تەحەمول بکەم."

ئایا باشتر نییە لەجێی جیاکردنەوەی ئیش و فەراغ، بە کۆکراوەی ژیانی بزانین؟ خۆش ویستنی ئیشێك وەکوو عاشق بوونەوە، عەشق لەوانەیە لە سەرەتاوە لە هەستی توندڕەوانە سەرچاوە بگرێت بەڵام لە درێژماوەدا پێویستی بە بڕیاری یەکلاکەرەوە هەیە.

## ئەوپەڕی هەوڵ

"ئیش تەنها کاتێك بایەخ و باوەڕپێکراوی هەیە کە ئازادانە قبوڵ بکرێت."

"ئالبر کامۆ"

بەپێی دوو هۆکار دەبێ، لەهەر ئیشێکدا، ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان بدەین. یەکەم بەهۆی شادی خۆمانەوە. سەردەمی قوتابیخانە وەبیر

بهێننەوە. ئایا لەو ڕۆژانەی کە هەموو پێوتراوەکانتان جێبەجێ کردبوو بە خۆشی و زەوقێکی زیاترەوە بۆ قوتابیخانە نەدەچوون؟ گرنگ نییە کە پەنجا ساڵ لەو ڕۆژانە تێپەڕیوە، ئەسڵی تکەلیف نووسین هەر ماوە. مامۆستایان، بەپرس و دایك و باوکی ئێمە، بەردەوام ئێمەیان هان داوە بۆ ئیشی دژوار، بەلاّم لەبەر رازی بوونی ئەوان نا، لەبەر رازی بوونی خۆمان، ئاوەهامان کردووە.

دووهەم ئەوەیە کە ئەم جیهانە لەشقورسی و لەخۆڕازی بوون بە جۆرێك تەمێ دەکات. کاتێك ئیشەکەمان سەرسەری سەیر دەکەین بەرهەمی پەسەند بەدەست ناهێنرێت. لە بۆکسۆرێك پرسیار بکەن کە ئەگەر بەرامبەرەکەت بە کەم بزانی چ دەبێت؟ وشەیەك هەیە کە بەکارهێنانی ئەوپەڕی هەوڵ بە باشترین شێوە وەسف دەکات و ئەویش "ئەکادیمی گەری"یە.

تا ئێستا سەرنجتان داوە کە ئیش کردن بۆ برێك لە شۆفیر تەکسیەکان بەچێژە و بۆ کەسانێکی تر، ئازار، هەر ئەو ئیشە دووبارەیە! تازەگەری لەکوێ دایە؟ بەلاّم شۆفیرەکانی دەستەی دووهەم، فەلسەفەیەکی جیاوازیان هەیە. یادگار دەڵێت: "شۆفیرە باشەکان، چونکە شاد و بەزەوقن خزمەتگوزاری باش پێشکەش دەکەن." نە، بەتەواوی بە پێچەوانەوەیە. ئەوان چونکە خزمەتگوزاری باش پێشکەش دەکەن، شاد و بەزەوقن. ئەو کەسانەی کە لە ئیشەکەیان چێژ دەبن بەیانیان بەم دێڕە دەست پێدەکەن: "ئەمڕۆ دەمەوێت باشتر و کاریگەرتر لە دوێنێ بم". لەوانەیە هەمووکات بەشی سوور نەپێکن بەلاّم بەرەو مەبەست تەقە دەکەن.

ماوەیەک لەوەپێش بۆ بەشداری لە کونفڕانسێک دا بۆ سەنگاپور ڕۆیشتبووم و بڕیار وابوو کە لەگەڵ زیگ زیگلێر پێکەوە وتارخوێنی بکەم. زیگ زیاتر لە بیست ساڵە کە بەشێوەی ئەکادیمی سەبارەت بە دەروونناسی سمینار دەکات و لە هەموو جیهاندا بە یەکێک لە باشترینەکانی ئەم بەشە دەناسرێت. پێش دەست پێکردنی وتارخوێنیەکەی زیگ، پێم وت: "تۆ دەبێ تا ئێستا هەزاران جار ئەم وتانەت بەکارهێنابێت بۆ وتارخوێنی ئەمڕۆ چەندە کاتت تەرخان کردبوو؟ " وەڵامی دایەوە: "سێ کاتژمێر".

زیگ زیگلێر، سەرەڕای سەرکەوتنەکانی، قەت پشت بە شانس و بەخت و تولەڕێ نابەستێت، ئەو بەرامبەر بە ئیشەکەی بەڵێندارە و پێشکەوتنی بەردەوام بە ئەرکی پێویستی خۆی دەزانێت. ئەگەر بڵێم زیگ، مێشکی بەتوانایە غەدرمان لێکردووە چونکە بۆ لە لوتکەدا مانەوە، تەنها توانای مێشک بەس نییە.

## بۆ کێ ئیش دەکەن؟

"بەردەوام زیاتر لە مانگانەکەتان ئیش بکەن، ڕۆژێک دێت کە زیاتر لە ئیشەکەتان، مانگانە وەربگرن." چەند ڕۆژ لەوەپێش لە ریستورانێک دا لەگەڵ شاگردێکی بێ ئەدەب بەرەڕوو بووم. هەستم دەکرد کە بە هەڵسوکەوتی بە من دەڵێت: "کێ ئیزنی بە تۆ داوە بێیتە ئەم ریستورانە؟" بیست دەقەی خایاند تاکوو قاوەیەکی بۆ هێنام و سەرەڕای ئەوەیش نیوەی ڕشتبوە نێو ژێرپیاڵەکەوە. سەبارەت بە ئیش و بەرپرسەکەی پرسیارم لێکرد و وتی: "تەئکید بە کە نامەوێت هەموو تەمەنم بۆ ئەم کابرا نالەبارە ئیش بکەم."

بەداخـەوە، ئـەو لـەم خاڵـە بنەڕەتیـە لەسـەر ژیـان لـە شـوێنی ئیـشدا تێنەگەیشتبوو کـە "ئێمـە بۆ بەرپرسـەکەمان ئیش ناکـەین، بۆ خۆمـان ئیش دەکەین."

ئێـوە هـیچ بەڕێوەبـەرێکی بـێ عـەیب و رەخنـە نادۆزنـەوە بـەڵام ئەگـەر بڕیارنامەتان ئیمزا کرد دەبێ بەهەموو توانای خۆتانەوە ئیشی بۆ بکـەن و نـەك ئـەوەی کـە بـەدووی خاڵـە لاوازەکـانی دا بگـەڕێن. کاتێـك کـە بەتـەواوی توانـای خۆتـان بـەکارناهێنن زیـاتر لـە بەرپرسـەکەتان ئـازار دەچێژن، ئەو تەنها چەند دۆلار لەدەست ئەدات بەڵام ئێـوە حـەز و باوەڕ بەخۆیی خۆتان لەناودەبەن.

## ئەگەر ئیشێکی چاکم دەبوو....

کۆمەڵێك باوەڕیان وایە کە ئیشەکان بەدوو بەشی شاد و ماندوو دابەش دەبێت. بەمجۆرە نییە. مرۆڤێکـی شـاد دەتوانێـت ئیشێکی بێزارکەر لـە بێـزاری بگۆڕێـت. ئەمـە بـەو مانایـە نییـە کـە فەرمانبـەرێکی بـێ ئـیش کراوی بانك دەبێ بیست ساڵی تەواو خـەریکی ئۆتۆمبیـل شـۆردن بێت، بـەڵام چـەند مـانگ ئۆتۆمبیـل شـۆردن دەتوانێـت دەرمانێکی چاك بێت! لەبەرئەوەی کە لەخۆبایی بوون، ئەنجامی هەبوویی و فراوانـی نیعمەتـە. دیکـۆراتێکی لـەخۆڕازی دەڵێـت: "مـن دیکـۆراتی خـانوو دەکـەم بـەڵام دیکـۆراتی پەنجـەرەکان پەیوەنـدی بـە منـەوە نییـە." بەدڵنیاییـەوە بـۆ بەڕێوەبـەرێکی دەرکـراو کـە خـۆی بـۆ مـەقامێکی بـەرزتر ئامـادە کـردووە وێناکردنی شاگردی ریستوران ئاسان نییە.

چێژ بردن لە ئیش، بڕیار و هەڵبژاردنە. کریستۆفەری برام، بەڕاستی دەزانێت کە لە ئیشێکی بێزارکەر، چۆن بیرەوەریەکی هەمیشەیی دروست بکات. ئەگەر بڕیار دەبوو بۆ هەڵکەندنی چاڵێک، بۆیاخ کردنی دیوار و یان هەر ئیشێکی دیکە، شاگردێک هەڵبژێرم بەدڵنیاییەوە ئەوم هەڵدەبژارد. چۆنکە ئەو هەر ئێشێک بە بەچێژ دەزانێت. باوەڕم پێبکەن کە پەڕ کەندنەوەی مریشك لەگەڵ کریستۆفردا بە میوانیەکی شاهانە ناگۆڕمەوە.

## کورتەی وتە

بەردەوام و لە هەر ئیشێك دا ئەوپەڕی هەوڵی خۆتان بدەن، نەك لەبەر ئەوەی کە لەسەر خەڵکی کاریگەریتان هەبێت بەڵکوو لەبەر ئەوەی ئەمە تەنها ڕێگایە بۆ ئەوەی لە ئیش چێژ بەریت.

## ژیانی کاری ئێوە

ئەم کتێبە، ڕێنوێنێك بۆ ئیش نییە فەلسەفەیەك سەبارەت بە ژیانە کە دەڵێت: "ئێوە تەنها یەك جار ژیان دەکەن کەوایە تەمەنی خۆتان بە ئەنجام دانی ئیشێك تێپەڕێنن کە خۆشتان دەوێت. بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا پێویستە کە ئەم دوو ئایدیایە قبوڵ بکەن:

١- بەردەوام ئەم ڕێکەوتە بوونی هەیە کە مرۆڤ، لانیکەم کاتی فەراغیش بێت، خەریکی ئیشی دڵویستی خۆی بێت. کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان بەردەوام ڕۆڵی قوربانی دەبینن و هەرگیز هیچ کاتێك بۆ ئەنجام دانی ئیشەکانی خۆیان تەرخان ناکەن. ئەگەر نەتوانن لە کاتی فەراغ دا،

ئیشی دڵویستی خۆتان ئەنجام بدەن گومانی تێدایە کە لە کاتەکانی دیکەش دا، بۆ ئەنجام دانی ئیشی دڵویستان ڕێگا بەخۆتان بدەن.
٢- بەردەوام ئەم ڕێکەوتە بوونی هەیە کە مرۆڤ لەبری ئەنجامی دانی ئیشی دڵویستی خۆی، مانگانە وەربگرێت. زۆربەمان بەم باوەڕەوە گەورە بووین کە ئیش بەمانای دەرد و ڕەنجە. هەڵەیە! ملوێنەها کەس لە جیهاندا هەیە کە لەبری ئیشی ئاسان،حەقدەستی زۆر وەردەگرن.
ئێستا با بزانین کە مەبەستی ئێمە لە "ئەنجامی دانی ئیشی دڵویست" چ شتێك نییە. ئەنجام دانی ئیشی دڵویست بەمانای دەرکردنی چەك بە مەبەستی لێخەوتن لەپاڵ قەراخ ئاودا نییە. ئەنجامی دانی ئیشی دڵویست بە مانای حەزلێکردن لە ئەنجام دانی ئیشێك و تەرخان کردنی هەموو عەشق و توانا و داهێنان لەسەر ئیشێکە. ئەنجام دانی ئیشی دڵویست، دڵ لە دەریا دانە و بەزۆری دوا ئامانج خۆرازی کردنە. گومان و دڵەڕواکێ، نیوەی چێژی ئیشە کاتێك کە مشتومڕ و خەباتێك لەئارادا نەبێت، وائەزانی کە شتێکت لێ ون بووە هەر بەم هۆیەیە کە زۆرێك لە منداڵی بنەماڵە بەناوبانگ و دەوڵەمەندەکان، ڕوو دەکەنە مادە سڕکەرەکان و خۆیان لەناو دەبەن، چونە لە ژیانی ئەواندا خەباتێك بوونی نییە و هەموو پێویستیە ماددییەکانیان جێبەجێ کراوە.
ژیانی ئێوە تەنها کاتێك وەبەر دێت کە بەرپرسی هەموو بڕیارەکانتان وەئەستۆ بگرن. وە گرنگترین بڕیاری ژیان هەڵبژاردنی ئیشە.
لە یادگار پرسیار بکەن: "بۆچی ئەم ئیشەت هەڵبژاردووە؟" ئەو دەڵێت: "خۆ دەبێ هەر کەس ئیشێك بکات!" نە، یادگار ئەم هۆکارێکی پەسەند نییە. هیچ کەس بەهۆی بەفیڕۆ دانی ژیانتەوە، مەدالیایەك بەتۆ نادات.

ئەگەر بەدڵ باوەڕتان هەیە کە ئەم ئیشە، ئیشی ئێوە نییە بیگۆڕن. ئێشێك هەڵبژێرن کە حەزتان لێی بێت.

## من نازانم چ ئیشێکم خۆش دەوێت

ئەگەر نازانن حەزتان لە چ ئیشێکە لەوانەی هۆکاری ئەوە بێت کە سالانێکە گوێتان لەقسەی دڵتان نەگرتووە. زۆرێك لە ئێمە بۆ دڵخۆش کردنی بنەماڵەکانمان، بەکەسانێکتر بووین و حەزەکانی خۆمان بەقوربانی کردووە: ئێوە حەزتان لە یاری بالە دەکرد بەڵام دایکتان پیانۆی پەسەند دەکرد. بەردەوام ئاواتتان سواربوونی ئۆتۆمبیلی سپۆرت بوو بەڵام بەردەوام ئۆتۆمبیلی سادەتان دەکڕی، ئەتانویست ببنە رۆژنامەنووس بەلاً بوونە ژمێریار، بەردەوام ئاواتتان سەفەر بۆ ئەمریکای باکوور بوو بەڵام مامتان حەزی لەوێ نەبوو. بەردەوام بەرەو رابواردنی شیاو رۆیشتن و بەردەوام کردەوەتان بەپێی چاوەڕوان لێکردنتان بوو.

بەڵام دواجار رۆژێك هاتووە کە چاوتان کردۆتەوە و بەخۆتان وتووە: "من نازانم کە کێم بەڵام دەزانم کە ئەدی نامەوێت ئەمە بم و ئەدی نامەوێت ئەم ئیشە ئەنجام بدەم."

ئەگەر حەزەکانتان بۆ ماوەیەکی زۆر لەخۆتاندا کپ کردبێت لەوانەیە تەنانەت لەبیرتان نەمابێت. لەڕاستیدا دا ورتەیەکی دەروونی پێتان دەڵێت: "ئەمە لەخۆڕازی بوونە کە ئیشی دڵویستی خۆت بکەی." ئەم ورتە دەرونیە تەنانەت لەوانەشە بڵێت:" تۆ رقت لە ئیشەکەتە بەڵام ئەم ئیشە لە مەسڵەحەتی تۆ دایە." ئەم ئەگەرەش هەیە کە بەهۆی ئەو

چاوەڕوانیەی کە خەڵکی هەیەتی بەڕاستی وابزانن کە لە ئیشەکەتان ڕازین. بەڵام ئەگەر بەڕاستی ئیشەکەتان خۆش بوێت دەبێت ئەم نیشانانە لە ئێوە دا بوونی هەبێ:

١- بەیانان بە ئاسوودەیی وەخەبەر دێن و هیچ کات ناتانەوێت ئیستراحەت بکەن.

٢- لەکاتی ئیش دا، خۆت و کاتیش لەبیر دەکەیت.

٣- ئەنجامی تێکۆشان، کەمترین بایەخی بۆ ئێوە هەیە.

## چۆن سەرلەنوێ حەزەکانم بدۆزمەوە؟

ژیان سادە و ئاسان بکەن. لە ئەنجامی دانی ئەو ئیشانەی بەشێوە خوی لێهاتووە، خۆبپارێزن. بڕێک لە خاڵە بێسوودەکان لە ڕەوتی ئاسایی ژیانتان بسڕنەوە بۆ ئەوەی بتوانن ژیانتان بەڕوونی ببینن. سەیرکردنی تەلەفزیۆن بۆ ماوەی مانگێک وەلا بنێن. سەرنج بدەنە ئەوەی کە دەیخوێننەوە و بیری لێدەکەنەوە. گوێ لە ورتەی دڵتان بگرن کە دەڵێت: " من ئەم ئیشەم خۆش دەوێت، بەرامبەر بەم ئیشە سۆزم هەیە." گوێ بگرە! سەردانی کتێبخانەی گشتی شارەکەتان بکەن. بە وردبینیەوە سەیری هەموو قەفەسەکان بکەن. کامەیان ئێوە ڕادەکێشێت؟

ئیشە تازەکان تاقی بکەنەوە: بۆیاخ کردن، یاری کۆنگفۆ و کاراتێ، ماموستای وەرزشی یاری منداڵان، زمانی ئیتالیایی و ... لەوانەی دە شتی تازە تاقی بکەنەوە و نۆی لەوانە دڵتان نەگرێت بەڵام چ مەعلوم ژمارە دە، دنیایەکی نوێ بۆ ئێوە بکاتەوە و ئەگەر ئاوەها نەبوو دەی

دیکە تاقی بکەنەوە. بۆ دۆزینەوە، گەڕان پێویستە. ئەگەر بەرەویی ژیانی خۆتان ون کردووە لەوانەیە لە پێکی شەراب دا نەیدۆزنەوە. مۆڵەتێک بەخۆتان بدەن. کات و فەزای بەسەندە بەخۆتان بدەن بۆ ئەوەی ئەوانەی کە بۆتان گرنگە تاووتوێ بکەن. ماوەی حەوتوویەک بە تەنها بۆ کەناری ئاو یان کوێستان بڕۆن. یادگار دەڵێت: "بۆ ئەم ئیشە، کاتم نییە." رێک وەک ئەوە وایە کە بڵێین: "من رێگاکەم لێ ون بووە بەڵام چونکە درەنگە سەیری نەخشە ناکەم.

گرنگترین مەسەلە ئەوەیە کە ئایدیای "دەست پێکردنی ئیشی دڵویست"ی خۆتان قبوڵ بکەن. بۆ ئەنجام دانی ئیشێک کە خۆشتان دەوێت دەبێ سەرەتا باوەڕ بە بەڕێوەچوونی بکەن. کاتێک کە ئیشی دڵویستی خۆتان دۆزییەوە وەڵامی ئەم پرسیارەش ئەدۆزنەوە کە : "من ئەمەوێت چی لە ژیانم بکەم؟"

## کورتەی وتە

زۆرێک لە خەڵکی نازانن کە چییان ئەوێت و دوجاریش نیگەران و دڵشکاون کە بۆچی ئەو شتەی کە خۆیان نازنن چییە، بۆچی وەدەستیان نەهێناوە. ئەگەر بەوردی نازانن کە چیتان دەوێت نزیکترین خاڵ بە ئامانجەکەتان بدۆزنەوە و جووڵەتان لەوێوە دەست پێبکەن.

## لێهاتن

لێهاتن، بەتەئکید بەمانای داهێنانی شاکارێکی هونەری نییە. بایەخ دان بە خەڵکیش لێهاتنە، فێربوونیش لێهاتنە، شیکاری مەسەلە،

بەڕێوەبەری و منداڵداراییش، لێهاتنە. بەداخەوە ئێمە بەزۆری لێهاتووییەکانی خۆمان بەکەم دەزانین. هونەرمەندی شێوەکار دەڵێت: "ئەگەر دەمتوانی مۆسیقا دابنێم هونەرمەند بووم" و مۆسیقازان دەڵێت: "ئەگەر دەمتوانی بە پەنجەکانم داهێنان بکەم... " توانایی و لێهاتنەکانی خۆتان لەگەڵ کەسانی دیکە بەراورد مەکەن. ئەو ئیشەی کە دەتوانن بیکەن، ئەنجامی بدەن. لێهاتنەکانی خۆتان قبوڵ بکەن و ڕێزیان لێ بگرن. هەستی رازی بوون، لە کامڵ بوونی لێهاتنە سروشتیەکانی خۆتان بەدەست دێت و نەك لە داخ و ئاخ بۆ لێهاتنەکانی خەڵکانی دیکە. سارا دەڵێت: "من لێهاتنێکی سریشتیم هەیە بۆ مامۆستای باخچەی منداڵان بەڵام لەوانەیە خوا بیەوێت کە من فەرمانبەری بانك بم." ئەگەر بەڕاستی خوا ئاوەها لێهاتنێکی لەتۆدا داناوە، ئەدی بۆچی ئەبێ ئاوەها شتێکی بوێت؟ کاتێك تۆ دەتوانی لێهاتنەکانی خۆت بدۆزیتەوە، ئەویش دەتوانێت.

خاڵێکی دیکە کە ئاگاداری بووم ئەوەیە کە " زۆربەی ئەو کەسانەی هەست بە نەبوونی لێهاتەیی دەکەن هیچ کات ئیشی جۆراوجۆریان تاقی نەکردۆتەوە."

ئەوەش بڵێم کە لێهاتن هەرچەندە بەسوود بێت بەڵام هەموو شتێك نییە! کاتێك کە خەڵکی سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی یاریزانێك قسە دەکەن بەزۆری باس لە لێهاتنە سەروئاساییەکانی ئەو دەکەن. بەڵام کاتێك لە گوێ لە قسەی خودی ئەو یاریزانە دەگرین، ئەو باس لە هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوام و ماندوونەناسانە دەکات و دەزانێت کە خاڵی جیاوازی ئەو لەگەڵ خەڵکی دا، هەوڵی بەردەوام و ماندوونەناسی و روانگەی ئەو بووە.

مرۆڤە سەرنەکەوتوو و دەرەوەییەکان، تەئکیدی زۆر لەسەر لێهاتووی دەکەن. بەبۆچوونی ئەوان نەبوونی لێهاتەیی، بیانویەکی زۆر باشە بۆ دەستەوئەژنۆ دانیشتن و تەممەڵی کردن. ئەگەر تایبەتمەندییەکی هاوبەش و زەق لە هەموو هونەرمەندە گەورەکان، زانایان، ئەستێرە یاریزانەکان و مێشکە ئابووریەکان دا بوونی هەبێت بەبێ گومان ئەو تایبەتمەندییە، لێهاتەیی ئەوان نییە بەڵکوو تەرکیز کردنی ئەوانە. کاتێك کە زانیتان بەدووی چی دان ئەو کات ئەوەی کە دەمێنێتەوە، چەقبەستوو کردنی تواناکانە. هیچ کەس ناتوانێت هەموو ئیشەکان بە تەنهایی و یەکجارە ئەنجام بدات. هیچ کەس ناتوانێت ماسیەکان بپارێزێت و هاوکات نەخۆشەکانیش دەرمان بکات و جیالەوەش کون بوونی جەو چارەسەر بکات. باشتروایە کە بۆ خەڵکانی دیکەش ئیش بهێڵینەوە.

## لەکاتی فەراغ کەڵك وەربگرن

ئیش، خۆشەویستیەکە کە دەبینرێت.

((کهلیل جیبران))

زۆرێك لە کەسەکان، وردە وردە سەرگەرمی خۆیان بەئیشی بەردەوام دەکەن. سۆران عاشقی رەسم گرتنە و کاتی فەراغی خۆی بۆ ئەم ئیشە تەرخان کردووە. ئەو لە بۆنە و ئاهەنگی هاورێکانی رەسم دەگرێت و لەچەندنی فستیڤالیٚ ئاماتۆری رەسم دا خەلاتی وەرگرتووە. وردە وردە حەجمی چالاکیەکەی پەرە پێدەدات. لەماوەی دوو سیٚ ساڵدا، داهاتی کۆتایی حەوتووی وەپێش داهاتووی هەموو حەوتووی لە فەرمانگەدا

دەکەوێت. هەڵبەت لەوانەیە بڕێک لە زەماوەندەکان تێک بچێت و کۆمەڵێك لە کڕیارەکان پارە نەدەن، لەوانەیە لە بڕێک کات دا، ئیش نەبێت بەڵام بۆ یادگار گرنگی خۆی هەیە.

ئەسرین عاشقی زمانە بێگانەکانە، ئەو بەسەر زمانی ئینگلیزی و ئیتالیاییدا زاڵە و ئێستا بڕیاری داوە فێری زمانی ئیسپانیایی بێت. کاتی پشوو بۆ بارسلۆنا سەفەر دەکات. بۆ گەشە لە زمانی ئیسپانیایی، بە بەلاش سەفەرکردەکانی ئەمریکای باشوور فێری ئینگلیزی دەکات. دوای سێ ساڵی بەسەر زمانی سێهەم دا زاڵ دەبێت. ئەسرین بۆ وەرگرتن لە سێ نووسینگەی موسافیرەتی دا ئامادە دەبێت، بەڵام قبوڵ ناکرێت. بۆ باشترکردنی لێزانییەکەی لە خولێکی وەرگێران دا بەشداری دەکات، لەئەنجام دا لە پەیمانگایەکی زماندا وەردەگیرێت.

کارۆ عاشقی کێوپێوان و دەوراهەڵدانە لە کوێستاندا و بۆ ئەم ئیشە، پێڵاوی شیاو، دەوار و کەرەسە پێویستەکانی لەبەردەست دایە. ئەو ئاگاداری ئەوەیە کە زۆرێک حەزیان لە گەڕانی کوێستانە بەڵام کەرەستەی پێویستیان نییە. کارۆ کەرەستەکانی خۆی بەکرێ بەوان ئەدات. بڕێکجار تەنانەت سەفەر ساز دەکات. لەوانەیە بڕێک لە کەسەکان تەنافەکانی ون بکەن و دەوارەکانی بسووتێنن بەڵام کارۆ بەمشێوە دەیسەلمێنێت کە :"هیچ ئیشێك بێ عەیبت نییە هەرچیش بێت لە ئیشی پێشترم لە گۆڕستان دا خۆ باشترە."

لەم جۆرەکەسانە دەبێ چی فێر ببین؟

١- فێردەبین کە دەتوانین بە ئەنجام دانی ئیشی دڵویست دەتوانین گوزەرانی ژیان دابین بکەین.

٢- جیهان بازاڕێکی گەورەیە کاتێک ئێوە شارەزاییەک بەدەست دەهێنن، کەسانێک دەبن کە لەبری ئەو شارەزاییەدا پارە بدەن.

٣- هەروەها فێری ئەوەش دەبین کە ژیان بەڕاستی لەگەڵ ئاوات و خەیاڵەکای ئێمە زۆر جیاوازە. بۆ نموونە ئەوەی لە مێشکی کاروان دا تێدەپەڕێت، ئاوەهایە:

- کاتژمێر ٧:٣٠ ی پاش نیوەڕۆ، دیمەنی یەکەم: کاروان بڕیار ئەدات کە پێشانگایەکی داهێنانی جلوبەرگ رێبخات.
- کاتـژمێر ٧:٣٤ ی پـاش نێـوەڕۆ، دیمـەنی دووهـەم: کـاروان نووسینگەیەک بە رووبەری گۆڕەپانێک ئیجارە دەکات.
- کاتـژمێر ٧:٣٦ی پـاش نێـوەڕۆ، دیمـەنی سـێهەم: کـاروان بەڕێوەبەرێکی جێگر بۆخۆی هەڵدەبژێرێ و خۆی لە هاوایی دا خانەنشین دەکات.

بەلأم لـە دنیای راسـتیەکاندا، کـاروان بـۆ وەرگـرتنی وام سـەردانی هەشـت بانـک دەکـات. پـشووی کۆتـایی حـەوتوو لـە خواردەمەنیـەک ئـیش دەکـات و ئیـشی داهێنـانیش لـە نووسـینگەیەک بـە گـەورەیی ئاودەسێک دەست پێدەکات.

ژیـانی حـەقیقی، بـێ هیـوایی زۆرتـرە. لـە ژیـانی حـەقیقی دا هـیچ ئیشێک بـەم خێراییـە نـاڕوات. ئـەو کەسانەی کە سەرگەرمیەکەیان دەکەنـە ئیـشی خۆیـان، کـاتێکی زۆر بـە دانیـشتن و سـەیرکردنی خـەڵکانی دیکـە بـەفیڕۆ نـادەن. ژیـان کـردن لەگـەڵ ژیـانی خـەڵکی رێگایەکی چاک نییە بۆ ژیان کردن.

## کورتەی وتە

ئەگەر ئەتانەوێت ژیانتان بە ئەنجام دانی ئیشی دڵویستتان دابین بکەن، دەتوانن لە سەرگەرمیەکەتان وەکوو سەرچاوەیەکی دارایی کەڵك وەربگرن. تا ئەو جێگایەی کە دەتوانن لە سەرگەرمی کاتی فەراغتان بۆ هەڵبژاردنی ئیش کەڵك وەربگرن.

## سەمتی خۆتان بگۆڕن

باوکی من بەردەوام ئیشێکی دەکرد کە خۆشی دەویست. ئەو لە چاخە جیاوازەکانی ژیانی دا مەلەوانی، قەسابی، کەشاوەرزی، داهێنان، هونەرمەند و راوێژکاری ملکی بوو و من بەم باوەڕەوە گەورە بووکە کە " مانای ئیش ئەنجام دانی ئەو شتەیە کە خۆشمان دەوێت." هەر لەو رۆژانەوە وامدانا کە "هەرکات ئیشێکی تازەتان ویست هەرلەو کاتەوە دەستی پێبکەن." کەوایە جیاواز لە زۆرێك لە کەسەکان کە بۆ بە ئاوات گەیشتنیان پێویستیان بە غیرەت و خۆڕاگری لە بەرامبەر گوشارەکانی دایك و باوکیان هەبوو، من قەت لەگەڵ ئاوەها کێشەگەلێك بەرەڕوو نەبووم. لەبیرم دێت کاتێك بە باوکم وت: "ئەمەوێت واز لە یاسا بهێنم و بڕۆم بەدووی هونەردا" وتی: "ئەگەر ئەمە ئیشێکە کە خۆشت دەوێت، زۆر چاکە!"

تا تەمەنی بیست‌وپێنج ساڵانیش خەریکی وێنەکێشان بووم تا ئەوەی کە لەژێر کاریگەری بیرکردنەوەی پۆزەتیڤدا، گۆڕدرام. ئەوکاتە بوو کە بڕیارم دا وێنەکێشان وەکوو سەرگەرمی درێژە پێبدەم و دەرس وتنەوە و وتارخوێنی لەبواری تەندرووستی دەروونی و کامڵ بوونی

تاکەکەسی دا بەپیشەی بنەڕەتی خۆم بکەم. لە نزیکەی تەمەنی سی سالأندا، نووسینی کتێبم دەست پێکرد و بۆ نموونەی کتێبێەکانم، لە وێنەکێشانم کەڵکم وەرگرت. وە ئێستاکە بەشی گەورەی ئیشەکەم بۆ وتارخوێنی لە کونفرانسە جیاوازەکاندا تەرخان کردووە، بەڵام بۆچی ئەم کتێبەم نووسی؟ کاتێك هەستم بەوە کرد کە زۆرێك لە خەڵك رێگای ئەنجام دانی ئیشی دڵویستی خۆیان نادۆزنەوە بەڕاستی خەمبار دەبووم. بۆ دۆزینەوەی مانا و سۆز لە ئیش دا دەبێ پێڕەوی دڵتان بن. من لەسەر ئەم باوەڕەم و لەگەڵیدا ژیان دەکەم. ئاشکرایە کە هەموو مرۆڤەکان حەزناکەن بەرپرسی خۆیان بن و لە برێك لە ئیشەکاندا وەکوو فرۆکەوانی بەزۆری ئەم مەجالە بوونی نییە. جیالەوەش کۆمەڵێك کەس ئەوە پەسەند دەکەن کە یەك ئیشیان هەبێت بەڵام لای من سەیر ئەوەیە کە بۆچی ئەم هەموو مرۆڤە، بەزۆری بە بیانووگەلێکی سست و پەسەندنەکراوەوە لەسەر ئەو ئیشانەی کە لێی بێزارن ئامادە دەبن. من بەوەم زانیوە کە هەر کەسێك ئیشێك هەڵدەبژێرێت کە لەگەڵ سیستمی باوەڕی ئەودا گونجاوە.

رێگای ئیش کردنی زۆرێك لەئێمە لە لایەن لاوێکی نەزانەوە دابین دەکرێت، خودی خومان! ئەگەر لە تەمەنی حەڤدە سالأندا ئیشێکتان هەڵبژاردوە و هێشتاش درێژە بەو ئیشە ئەدەن، لەوانەیە ئیتر کاتی ئەوە هاتبێت کە ئیشێکی نوێ هەڵبژێرن. ژیانی خۆتان تەنها لە یەك ئیشدا بەرتەسك مەکەنەوە.

وایدانێن کە وتنەوەی مۆسیقا، ئیشی دڵویستی ئێوە بووە بەڵام ئێوە بەویستی باوکتان ئەندازیاریتان کردووە. قسەکانی باوکتان هەموو رۆژێك لە گوێتاندا دەزرنگێتەوە: "تۆ سەرکەوتن گەلێکت هەیە کە من

قەت نەمبووە. خۆزگە دەمتوانی پرد دروست بکەم." ئێستا دەبێ چ بکەن؟ پیانۆکە کۆك بکەن!

سەرەتا لەبەر باوکت ئەم ئیشە بکە: ئێوە ناتوانن بەپێی خواستەکانی خەڵك بژین. باوکتان دەبێ بۆ ژیانی خۆی حەزگەلێك بدۆزێتەوە. تانەوکاتەی کە بۆ رازی کردنی باوکتان خۆتان دەکەنە قوربانی گەشەی خۆت و گەشەی ئەویش دوا دەخەن. ئێوە بۆ ئۆرگاسمی ئاواتەکانی دایك و باوکتان لەدایك نەبوون.

دووهەمیش لەبەر خۆتان ئەم ئیشە بکەن: ئایا لەبەر ئەوەی کە چوار ساڵ ئەندازیاریتان خوێندووە دەبێ چل ساڵ تەمەنی دواتری خۆتان بۆ ئیشێك کە لێی بێزارن بەفیڕۆ بدەن؟ نە! بەم ئیشە تەندرووستی دەروونی و جەستەیی خۆتان مەترسیدار دەکەن و بە بەرزەخ مەحکوم دەکرێن.

ئایا بەڕاستی دەبێ ئیشەکەمان خۆش بوێت؟ ئایا (بتهۆڤن) عاشقی مۆسیقا بوو؟ ئایا (فێراری) ئۆتۆمبیلە خێراکانی خۆش دەویست؟ دوو دۆکتۆر لەبەرچاو بگرن کە یەکەمیان نەخۆشەکانی خۆش دەوێت و دەهەمیان ئۆتۆمبیلە مۆدیل بەرزەکەی. دەچنە لای کامەیان؟

یادگار دەڵێت: "کەوایە دەبێ من لە پۆست دەست هەڵبگرم و گرووپێکی مۆسیقا رێبخەم؟" ئەگەر مۆسیقات نەخوێندووە و چەند بەرنامەت بەڕێوەنەبردووە وەڵام (نە)! ئێمە لێرەدا باس لە ریسکی بەرنامەدار دەکەین. سەرەتا تواناکانی خۆمان پەروەردە دەکەین، زانایی خۆمان بەربلاو دەکەین، دەرس دەخوێنین، خوێندنەوەمان دەبێت، بۆ شارەزاییەکانی خۆمان، کڕیار دەدۆزینەوە.... دوجار و ئەوکات ئیشەکەمان دەگۆڕین.

یادگـار دەڵێـت: "مـن دەبـێ سەرپەرشـتی بنەماڵەیـەك بکـەم ئایـا چاوەڕوانی ئەوە لەمن دەکەن کە واز لە ئیشەکەم بهێنم؟" نە یادگار! ئەگەر دڵت لای شتێکی دیکەیە دەبێ لە درێـژماوەدا هەڵبژاردنەکەت ئەنجام بدەیت.

## ئیش لەبەر پارە

"زۆرێك لە مرۆڤەکان تەمەنێك خەرکی ماسیگری دەبن بەڵام هیچ کات تێناگەن کە بەدووی ماسیدا نین."

((هێنری دیوید تورۆ))

ئەگـەر تـەنها لەبـەر پـارە ئـیش دەکـەن هـیچ کـات بەختـەوەر نـابن و لەوانەشە پارەیەکی وەها بەدەست نەهێنن. ئەمەیە شێوازی دنیا بۆ ناچار کردنی ئێوە بە ئیشێك کە خۆشتان دەوێت.

لە بەشی چوارەم دا باسمان لە نەبوونی پەیوەستەیی کرد. کاتێ کە بەڕاستی ئیشەکەتان خۆش بوێت پەیوەستەیی ئێوە بە داهاتتانەوە کەمتر دەبێت و کەوایە بیر لە شتێك لەسەرو پارەوە دەکەنەوە. پارە، یارییە و ئێوە بە یاری کردن سەرکەوتوو دەبن و نەك بە ئازار کێشان. بەبێ لەبەرچاو گرتنی جۆری ئیشەکەتان کۆمەڵێك رقەبەر لە بەرامبەر ئێوە دا هەن کە ئیشەکەیان خۆش دەوێت و ئەگەر ئێوەش وەك ئەوان نەبن ناچار بە چوونە دەرەوە لە دیمەنی رقەبەرێتی دەبن. ئایا جێگایەك بۆ ئێوە هەیە؟ بەڵێ! بۆ هەر ئێشێك کە لە ئاستی شیاودا بێت فەزایەی پێویست بوونی هەیە. ٨٠٪ی مرۆڤەکان زۆر چاك و میهرەبانن و لە کۆمەڵێك لایەنیشەوە، ئاسایی. دوایین جارێك کە لە کاتی خۆیدا

گەیشتنە لای دوکتۆر کەی بوو؟ دوایین جارێک کە لە خواردەمەنیک دا خزمەتگوارییەکی باش پێشکەشتان کرا کەی بوو؟ دوایین جارێک کە سواری تەکسیەکی خاوێن بوون، وەبیرتان دێت؟ بۆ ئەنجام دانی ئیشی دڵویست پێویست ناکات کە ساڵانێکی زۆر فێرکاری بکرێن و مەسرەفێکی زۆریش قبوڵ بکەین.

یادگار دەڵێت: "بەڵام ئەگەر ئەو ئیشەی کە حەزم لێی بوو دەمکرد هیچکات بەقەدەر ئێستا پارەم وەدەست نەدەهێنا."

ئەنجام دانی ئیشی دڵویست، بەزۆری لە درێژماوەدا سەروەتێکی زۆرتان بۆ پاشەکەوت دەکات بەڵام برێک جاریش ئاوەها نییە. برێک جار بە ئەنجام دانی ئەو ئیشەی کە خۆشتان دەوێت هەست بە پێویستی کەمتر بە پارە دەکەن.

وایدانێن کە بەڕێوەبەری گشتی شیرکەتێکن خانوویەکی گەورەتان هەیە چەند ئۆتۆمبیلی مۆدیل بەرز، ڤیلایەکی خەیاڵی و فاکتۆرگەلێک کە لەگەڵ مەقامی بەڕێوەبەری ئێوەدا دەگونجێ. بەڵام عەشقی حەقیقی ئێوە پەروەردە کردن ئەسپ و فێرکاری سواری ئەسپە و ئێوە دەڵێن: "من ناچارم بۆ پاراستنی ئەم شتانە، ئیشەکەم بپارێزم."

مەسەلە لێرەدایە کە کاتێک کە ئێوە دەبنە مامۆستای ئەسپ سواری لەوانەیە ئەدی پێوستتان بە خانوو و ئۆتۆمبیلی لەوجۆرە نەبێت. ئێمە برێک کات دەوروبەری خۆمان لە ئەسبابی یاری پڕ دەکەین بۆئەوەی مێشکی خۆمان لەم راستیە کە "لە ئیشەکەمان بێزارین" بەلاڕێ دا بەرین. ئەگەر پێڕەو دڵی خۆمان بین لەوانەیە بەم ئەنجام بگەین کە کێڵگەیەکی بچوک و ئۆتۆمبیلێکی بچووک بەس بێت.

# پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان لەبیر مەکەن

ئایا سەرنتان داوە کە پەرستارە چاکەکان، مرۆڤەکانیان لە ئیشەکەیان خۆشتر دەویێت. لەبیرتان بێت کە هەر ئیشێك بۆ گوزەراندنی ژیان ئەنجامی ئەدەن کەرەستەیەکە بۆ پەیوەست بوون بە خەڵکەوە. وە رازی بوون یان نەبوونی ئێوە لە ئیشەکەتان بەستراوە بە چۆنیەتی خزمەتگوزاریتانەوە بەرامبەر بە خەڵك. (ئالبرت شوایتزر) وتوویەتی: "... لەنێوان ئێوەدا تەنها ئەو کەسانە شاد دەژین کە بەدووی خزمەت کردن بەخەڵکدا دەگەڕێن و پێی دەگەن." بەداخەوە "خزمەت کردن بە خەڵك" بە کۆیەلەیی یان قوربانی بوون شوبهێندراوە لە حاڵێکدا حەقیقەت جگ لەمە نییە. خزمەت کردن بە تەنهایی بە مانای ئەوەیە کە لە تەرخان کردنی شتێکی تایبەت بەخۆمانەوە بۆ خەڵکی چێژێکی لەڕادەبەدەر شاراوەیە. وانەوتنەوە و پەرستاری کردن لە خەڵك دەتوانێت خزمەتگوزای بێت، گوڵفرۆشی یان چاککردنەوەی پانکەی ماڵی خەڵکی، بەبزەیەك لەسەر لێوەوە، دەتوانێت خزمەتێك بێت. خزمەت کردن بە خەڵك، پەیوەندی بەجۆری ئیشی ئێوەوە نییە خزمەت کردن بە خەڵك، بۆ فەلسەفەی باوەڕی ئێوە دەگەڕێتەوە. کۆمەڵگە، بەزۆری ئیشی مرۆڤەکان بەپێی دەرەجەی دبلۆم و ... پێوانە دەکات بەلاّم لەم پێوانە کردنەدا بەردەوام مەترسی لەبەرچاونەگرتنی پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان بوونی هەیە.

وایدانێن کە ئێوە سەرپەرشتی تیمێکی فوتبۆڵن و مندالأنی خوارو دوانزە ساڵ فێر دەکەن. لەوانەیە عاشقی فوتبۆڵ بن و ئەمە زۆر چاکە. بەلاّم تەنها ئێوە ئەوکاتە دەتوانی شتێك بۆ ئەم مندالأنە بکەن کە

تێبگەن مەسەلەی حەقیقی قەت فوتبۆڵ نییە. لەوانەیە بڵێن: "سەرپەرشتی تیمی فتبۆڵ ناتوانێت ژیانی منداڵانی دوانزە ساڵە بگۆڕێت." هەڵە دەکەن! کۆمەڵێکیان دەیگۆڕن و ئەوانە ئەو کەسانەن کە تێگەیشتوون بەم منداڵانە وانەی ژیان فێردەکەن و فۆتبۆڵ تەنها ئامرازێکە.

زۆرێک لە مامۆستاکان بەخۆیان دەڵێن: "بۆچی دەبێ گرنگی پێ بدەم؟ منداڵەکان هیچ بایەخێك بە حیساب و ماتماتیك نادەن." ئاشکرایە کە نایدەن! ئەگەر ئێوە مامۆستای پۆلی شەشەمن ئەرکی ئەساسی ئێوە وتنەوەی حیساب نییە، خودی منداڵەکانن. ئەرکی ئەساسی فەرمانبەرێکی بانك، پێڕاگەیشتن بە حیسابە بانکیەکان نییە بەڵکوو درووست کردنی پێوەنی لەگەڵ خەڵك دایە.

## تازەگەریتان هەبێت

چەند ساڵ لەوەپێش میوانی کتێبفرۆشێك لە شاری (دیۆتۆن ئۆهایوو) بووم. کاتێك لە فرۆشگەدا خەریکی کێشانی کاریکاتێر بووم فەرمانبەرانی فرۆشگە چیرۆکێکی رۆمانسیان سەبارەت بە دوو کەس لە کڕیارەکان بۆ گێڕامەوە:

رۆژێك کارۆ و پەیمان لە بەشێك لە فرۆشگەدا کە تایبەت بە کتێبی (وەدەستهێنانەوەی تەندرووستی) بوو، وەستا بوون و بە خەم و نیگەرانیەك کە لە سەروچاویان دەباری، بەبێزاریەوە سەیری کتێبەکانیان دەکرد. ئەو دوو کەسە بەم نزیکانە بەهۆی نەخۆشیەوە هاوسەرەکانیان لەدەست دابوو. سەری قسەیان کردەوە و هەردوو

کەسیان بڕیاریان دا کە پێکەوە لەو کۆبوونەوانەی کە بۆ تەسکینی خەم و نیگەرانی لێقۆماوەکان پێك دێت بەشداری بکەن و ئەمەش لەئەنجامدا هۆکارێك بوو بۆ هاوڕێیەتی.

پاش چەند مانگ لە گەڕانەوەی کارۆ دا پرسیارم لێکرد: "ئەوەی ئەتویست بەدەستت هێنا؟" سۆران وتی: "زیاتر لەوەی دەمویست! من، کتێب و دەزگیرانێك کە دەمویست لەم بەشەدا هاوکات هەردووکیم وەدەستم هێنا و پانزە رۆژیتر زەماوەند دەکەین!"

بەڕێوەبەر و فەرمانبەرانی کتێبفرۆشیەکە ئەوەندە سۆزدار بوون کە خۆبەخش بوون بۆ بەڕێوەبردنی مەراسیمەکە لە هۆڵی کتێبفرۆشیەکەدا! قەفەسەی کتێبەکان کۆکرانەوە. مێز و کورسیمان بەکرێ گرت، گوڵمان کڕی، فرۆشگەکەمان رازاندەوە و بەشێکیمان بەشێوەی ریستوران ئامادە کرد. فرۆشیارەکان، فرۆشتنی کتێبیان وەلا نا و لەجێی دەستیان کرد بە دابەش کردنی کێکی زەماوەندەکە. ئەمە ڕووداوێکی زۆر سەیر و هەست بزوێن بوو. نموونەیەکی زیندوو و روون کە پیشان ئەدات شادی و خۆشی لە تێکەڵ بوونی هەوڵ و خەیاڵەوە لەدایك دەبێت. بەرپرسەکانی ئەم کتێبفرۆشیە، بەشداری کردنیان هەڵبژارد و وتیان: "ئێمە دەتوانین یارمەتیدەر بین." بۆ فرۆشیارەکانیش زۆر ئاسانتر بوو کە بڵێن: "ئیشی ئێمە کتێبفرۆشیە بەڕێوەبردنی مەراسیمی زەماوەند پەیوەندی بە ئێمەوە نییە."

گرنگ نییە کە چ ئیشێك دەکەن گرنگ ئەوەیە کە چۆن ئەنجامی ئەدەن. خاوەنی کتێبفرۆشی بن، بەلەم درووست بکەن، مامۆستاتی باخچەی منداڵان، لەهەرحاڵدا دوو رێگا لە پێشتانە: یان دەتوانن هەر ئەو ئیشە

بکەن کە خەڵکانی تر دەیکەن و یان ئەوەی کە کەمێك خەیاڵ و تازەگەریشی پێ زیاد بکەن.

## کورتەی وتە

کاتێك کە ئەنجام دانی ئیشێك بەوپەڕ مەیل و بێ ناچاری هەڵدەبژێرین، شادی و خۆشی بۆ ژیانی خۆمان بانگەواز دەکەین.

## گرنگ نییە چ ئیشێك ئەنجام ئەدەم، گرنگ سەروەت و ناوبانگە!

بەرامبەری سانسکریت "ئامانجی مرۆڤ لە ژیاندا" وشەی "دهارما"یە. بەپێی یاسای دهارما "هەموو مرۆڤەکانی توانایی تایبەت بەخۆیان هەیە و بۆ دۆزینەوەی ئەم توانایانە، هەنگا دەنێنە ئەم جیهانەوە." بەپێی ئەم یاسا ئەگەری دۆزینەوەی ئەم توانایانە کاتێك زیاتر دەبێت کە پرسیار لەخۆمان بکەین: "دەتوانم چ شتێك ببەخشم؟" نەك ئەوەی کە: " دەتوانم چ شتێك بەدەست بهێنم؟"

بیل گیتس یەکێك لە دەوڵەمەندترین پیاوەکانی جیهانە. بەڵام کاتێك گوێ لە وتارخوێنی ئەو دەگرین تێدەگەین کە نەرم ئەفزاری کەمپیوتەر بۆ ئەو زۆر لە پارەیە سەرنج راکێشترە. دەوڵەمەند بوونی ئەو، ئامانج نییە بەڵکوو بەرهەمێکی لاپاڵە.

ناوبانیگیش، هەر ئاوەهایە. لە کەسە ناودارەکان پرسیار بکەن کە جیاواز لە نەبوونی ئاسایش و ئاسوودە نەبوون لە ناوبانگ چیتان دەستکەوتووە؟ بۆچی دەبێ مرۆڤ حەز بکات کە سوپایەك لە خەڵکانی

ئامۆ لە دار و دیواری ماڵەکەیەوە سەرکەون یان کاتێك لە شەقامێکەوە تێپەردەبێت پەنجا رەسمی لێ بگرن؟

## ئەگەر هەموو مرۆڤەکان ئیشی دڵویستی خۆیان ئەنجام ئەدا، ئەوکات کێ شەقامەکانی پینە دەکرد؟

ئەگەرچی لەوانەیە ئەم ئیەشە لەگەڵ حەزەکانی ئێوە نەگونجێت بەڵام باوەڕتان هەبێت کەسانێکیش هەن کە عاشقی هەوای ئازاد و مۆسیقای لادێ و ئۆتۆمبیلە گەورەکان و دووری لە قەرەباڵغی بن. هاوسێکەی ئێمە، (جوامێر) پسپۆڕی عەمەلیاتە، ماوەیەك لەوەپێش لە میوانیەك دا، ئەو خەریك بوو لەسەر عەمەلیاتی بواسیری شادکردنەوە کە هەر ئەو رۆژە ئەنجامی دابوو، قسەی دەکرد. لەحاڵێکدا کە هەوڵم ئەدا خۆم لە حاڵی ئەو عەمەلیاتەدا وێنا بکەم پێم وت: "بەڕاستی کە نوکتەیەکی پێکەنینیە!" بەڵام دواتر ئاگادار بووم کە ئەو بەجیدی قسە دەکات. لەڕاستیدا ئەم کردەوە لای ئەو زۆر سەیر بوو و لە بینینی بواسیرێکی چاك، چێژی دەبرد. مرۆڤەکانی حەزی جیاوازیان هەیە. هەموو ئێمە لە رێگای جیاواز لە سەمتێکی جیاواز لە جوولە داین. کاتێك کە بۆ ئەنجامی دانی ئیشی دڵویستتان وەڕێدەکەون بەردەوام کەسانێك هەن کە ئەیانەوێت بەر بە جوولەی ئێوە بگرن. ئەگەر ئیشی دڵویستی خۆم دەست پێبکەم ئایا کێشەی کەمترم دەبێت؟ نە! ئەرکی ئێوە لە ژیاندا "بێ کێشە ژیان" نییە بەڵکوو "بە مەبەستەوە ژیان"ە.

زۆرترین بەختی ئێوە بۆ بەختەوەری و سەروەت، ئەنجام دانی ئیشێکە کە خۆشتان دەوێت. عەشق، وزەیە و هەر ئیشێك لەگەڵ عەشق هاوڕا

بێت پڕە لە "وزەی بەرهەمهێنەر" و ئەمە، جۆرێکە لە وزەیە کە ئەگەر بوونی بە دۆلار زیاترە. بەلاّم نابێت وێنا بکرێت کە دەرد و رەنج و پێنەگیشتن لە ئارادا نابێت. من بەتەواوی دژم لەگەلّ کۆمەلێك کتێبی تازە کە بلاّوکەرەوەی ئەم وێنا نادروستانەن. پەیامی ئەم کتێبە ئاوەهایە: "پەیڕەوی ئاواتەکانی خۆتان بن و گسك لە پارە بدەن."

## کورتەی وتە

ئەنجامی ئیشی دلّویست بەواتای پێچراوەیەك بۆ ژیانێکی ئاسانتر نییە پێچراوەیەك بۆ ژیانێکی راکێشەرترە. ئەگەری زۆرترە لەم رێگایەدا لەگەلّ بەرپرسیاریەتی زۆرتر بەرەوڕوو دەبن و کێشەی زیاتر!

## رازی شاد ژیان

کاتێك کە دەستنووسی یەکەم کتێبم واتا "رازی شاد ژیان"م بردە لای پەخشار، پێیان وتم: "دوایین شتێك کە لەوانەیە دنیا پێویستی پیّ بێت کتێبێکی دیکەیە لە بواری تەندرووستی دەروونی دا" ئەوان جیالەوەش وتیان کە بۆ نووسینی کتێبگەلێك لەم چەشنە، بەتەئکید دەبێت دۆکتۆری دەروونناس بن جیالە یەك کەس کە پێشنیاری چاوپێکەوتنیان پیّ کردم.

لەئەنجام دا دوای ماوەی هەژدە مانگ پەخشارێکم لە سەنگاپوور دۆزیەوە. ئەوان پێیان وتم کە رقەبەرێتی لە بازاڕی کتێبێدا زۆر قورسە و تەلەفزیۆن و راگەیاندنەکان ئەوەندە حەزیان لە نووسەری نەناسراو نییە. ئێمە پێویستمان بە ئیستراتیژیەك هەبوو.

بڕیارمان دا کە "ڕازی شاد ژیان" ڕاستەوخۆ بەرینە نێو خەڵك. کاتێ کتێبەکەمان لە سەنگاپوردا بڵاوکردەوە من سێ پایەی نەقاش و میکرۆفۆنەکەم هەڵگرت و لەوانەیە بڵێم بۆ هەموو کتێبفرۆشیەکانی شارم برد و لەوێ دەستم کرد بە کێشانی کاریکاتێر، سەبارەت بە فەلسەفەکەم قسەم کرد و کتێبەکانم ئیمزا کرد. لە قوتابخانە و زانکۆکاندا لەگەڵ خوێندکارەکان قسەم کرد و لە فەرمانگە جۆراوجۆرەکاندا لەگەڵ فەرمانبەران باس و موناقشەم کرد و ئەوەندە درێژەم بەم شێوازەم دا کە "ڕازی شاد ژیان" چووە ریزی پڕفرۆشترین کتێبەکانی سەنگاپورەوە و دواتر هەر ئەم ئیستراتیژیە لە مالزی، ئوستڕالیا و .... بەکار هێنا.

شەش ساڵ بۆ شوێنە جیاوازەکانی جیهان سەفەرم کرد، لە مەخزەن و زیندانەکان دا وتارخوێنیم کرد و لە هەزار ناوەندی کڕین دا خەرکی کێشانی کاریکاتێر بووم، دەبێ ناوی کتێبی دواترم " ناوەندەکانی کڕینی جیهان" دانێم! لە زۆربەی ئەم کاتەدا لەم ئیشە چێژم دەبرد، بەڵام ڕۆژانێکش بوو کە لە ژووری هۆتێل دا کە لە خەو هەڵدەستام بەبێزاریەوە دەموت: "ئەگەر سەردانی کتێبفرۆشیەکی دیکە بکەم لەوانەیە هەڵیبێنمەوە."

کتێبفرۆشی بۆ کتێبفرۆشی، شار بە شار، وڵات بە وڵات گەڕاین تاکوو "ڕازی شاد ژیان"مان بە بازاڕی جیهانی کتێب ناساند و تازە ئەوکاتە بوو کە وردە وردە، ڕاگەیاندان و وێستگە تەلەفزیۆنیەکان بەدووی ئێمە کەوتن!

لەم سەفەرە درێژخایەنە بیرەوەری زۆرمان بۆ بەجێ ماوە" شەبەکەیەکی تەواوی پڕوپاگەندەمان لەکاتێکدا لە ئوستورالیا بەڕێوە برد کە هەموو

خەتە هەواییەکان مانیان گرتبوو، جارێکیش لە نیوزلەند ناچاریان کردم کە لە وێستگەیەکی رادیۆیی دا کارێکاتێر بکێشم!

بۆ ناساندنی کتێبی "رازی شاد ژیان" بە خەڵکی ئەمریکا، لە شوێنی باڵوێزخانەی ئوستترالیا لە مەنهەتن، میوانیەکمان بۆ راگەیاندنە گشتیەکان رێخست و بۆ هەموو رۆژنامە، گۆڤار و وێستگە رادیۆیی و تەلەفزیۆنیەکانی رۆژهەلاتی ئەمریکار کارتمان نارد و دەسپێکی میوانداری لە ۲۰۰ کەسمان ئامادە کرد، رۆژی دیاریکراو، واتا بیستی ژوئەنی ۱۹۹۰ بۆ بەشداری لەم مەراسیمەدا بەمەبەستی نیویۆرک سواری تەیارە بووم.

بەرێکەوت هەر لەو رۆژەدا وابڕیار بوو کە نلسۆن ماندلایش بۆ نیویۆرك بێت. چ ژمارەیەك لە هەواڵنێران چاوەڕوانیان دەکرد کە هەواڵی هاتنی ئاندرۆ متیۆسی بچووك لە هەواڵی هاتنی نلسۆن ماندلای گەورە گرنگتر بێت؟

سفر.

هەواڵنێران پرسیاریان لێم کرد: "چیت کرد کە توانیت یەك ملیۆن کتێب بفرۆشیت؟" و من لە وەڵامدا وتم: " دوو ملیۆن کیلومەتر سەفەرم کرد، پانسەد جار وتارخوێنیم کرد، هەزار جار چاوپێکەتن – و بیست و سێ جاریش جانتاکەم ون کرد!"

ئەمە چیرۆکی کتێبێك یان تەجارەتێك نییە بەسەرهاتێکە سەبارەت بە هەموو گەلاڵە سەکەوتووەکان. لەهەر کوێوە کە دەتوانن، دەست پێبکن. هەر ئیشێك کە دەتوانن ئەنجامی بدەن. باس لەسەر شانس و بەخت نییە، باس لە هەوڵ و تێکۆشانە.

## سۆز و خرۆش

ئەگەر خەریکی ئیشێکن کە خۆشتان دەوێت، سۆز و خرۆش، ئێوە تا کۆتاییەکەی دەبات، کاتێک کە بوونتان پڕ لە سۆزداری بێت ئەدی پێویست ناکات کە کەسانی تر، سۆزی ئێوە ببزوێنن.

ئەگەر ریستورانی خەیاڵی خۆتان بکەنەوە و هیچکەس بۆ خواردن رووتان تێنەکات نابێت واز لە هەوڵ و تێکۆشان بهێنن. خواردنی تازە، دیکۆارت و فکرەی تازە تاقی بکەنەوە. ئەگەر پارەتان تەواو بێت سۆز و خرۆشتان هەڵدەگرن و دەڕۆن بۆ لای کەسێك کە پارەیەکی زیاتری هەیە و ئەو بەهاوبەشی خۆتان دەکەن. لە چەند قۆناخ دا شکست دێنن، چەند جار سەرپرشتەکان دەگۆڕن بەڵام بەدڵ دەزانن کە سەرکەوتوو دەبن. گومانی تێدا نییە کە عەزم و ئیرادەی بەهێز و ماندوونەناستان دەوێت بەڵام سۆز و خرۆش، گرنگترین مەرجە. هێزی ژیان و مانەوە، لە بوونی ئامانج لە ژیان دا ریشە دەگرێت. ئێمە دەبێ هەر ئەو ئیشە بکەین کە سۆز و خرۆشمان پێ دەبەخشێت و ئەمە قەرزێکە بە خۆمان و کەسانی تریش. دنیای ئێمە پڕە لە مرۆڤی سارد و بێ سۆز کە بەرلەوەی چاویان بە ئاور کەوتبێت، سووتاون.

بەدووی خەیاڵ و ئاوات دا رۆیشتن، زەمانێك بۆ ژیانێکی ئاسان و بێ سەرئێشە نییە. بەتەواوی بەپێچەوانەوە، کاتێك پێڕەوی خەیاڵ و ئاواتەکانتان دەبن دنیا بۆ خەبات زیاتر لە جاران دەتانخوازێت بەڵام لەم رێبواریەوە، سەفەرێك دەست پێدەکات کە لەجێی خۆیدا لە ئەنجامدا سەفەرێکی دەروونی دروست دەکات و ئەوکاتەیە کە هەلێك بۆ پشکوتن دەدۆزنەوە و لە حەقیقەتی خود ئاگادار دەبن.

## کورتەی وتە

لە هەر کوێ و هەر جۆرێک کە هەن ناچار و پێبەستراو مەبن.
درەختەکان ئەسیری خاکن، ئێوە مرۆڤن!

## بیانووی ئێوە چییە؟

لەوانەیە ئێوە هەموو ئەم بەشەتان بە هەستی بێزاری و بەم بیرەوە خوێندبێتەوە کە: "بەڕێز متیۆس، ئەمە زۆرچاکە کە هەرکەسێک ئیشی دڵویست خۆی ئەنجام بدات، بەڵام خۆ ئێوە هەڵومەرجی من نازانن."
ئەگەر ئێوە ئاواتگەلێکتان هەیە کە وەدی نەهاتوون، بیانووەکەتان شیکار و لێی ورد ببنەوە. حەقیقەت ئەوەیە کە خودی خۆمان ئەوەندە ڕووڕاست نین. ئێمە زۆرێک لە شتەکان بە ناومکین ناودەبین بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە ئەوانە هۆکاری زەحمەتن، نەوەک ناموکین! سارا دەڵێت: "من بەڕاستی حەز دەکەم ئاسارناسی بخوێنم بەڵام بەداخەوە کە ناموکینە!" مەبەستی راستی سارا ئەوەیە کە: بۆ خوێندنی بەشی ئاسارناسی پێویستم هەیە بە:

١- دەرچوونی لە تاقیکردنەوەدا
٢- ئیشی نیوکات لە ریستوران
٣- هێنانی وام
٤- وازلێهێنانی پیاسەی شەوانە بۆ ماوەی چوار ساڵ
٥- هەموو خاڵەکانی سەرەوە

سارا بەم ئەنجامە دەگات کە ئاسارناسی، بەقەد ئەم هەموو هەوڵە ناهێنێت لەڕاستیدا سارا دەڵێت: "ئەگەر وادەزانن کە من ئامادەییم تێدایە بۆ قبوڵ کردنی ئەم هەموو کێشەیە کەوایە مێشکتان بەتاڵە!"

دلێر دەڵێت: "من حەز دەکەم خانوویەکی بچووکم بۆخۆم هەبێت." ئەو بیستوسیٚ ساڵە کە ئەم قسەیە دووپات دەکاتەوە بەڵام مەبەستی دلێر ئەوەیە:" من حەز دەکەم خانووم خۆم هەبێت بەومەرجەی کە:

١-ناچار نەبم زیاتر پاشەکەوت بکەم

٢-ناچار نەبم زیاتر ئیش بکەم

٣-ناچار نەبم لە گەڕەکە هەژارنشینەکاندا ژیان بکەم...

یادگار هەر کرێنشین دەمێنێتەوە!

سارا و دلێر بڕیاری تێگەیشتوویان داوە کە لەخودی خۆیدا نە درووستە و نە هەڵەش. وە ئەمە هیچ کێشەیەکی نییە بەڵام ئەوەی کە رووخێنەرە ئەمەیە کە ئەوان وائەنوێنن کە هیچ رێگایەکی دیکەیان نەبووە. چەند کەس دەناسن کە ئامادەن سوێند بخۆن کە مەجالی گۆڕینی ئیشیان نەبووە بەڵام لەناکاو بە نەخۆشیەکی دڵ ئامادەی گۆڕینی ئیش بوون؟ دەبیٚ خۆمان دەست پێبکەین و یان ئەوەی کە چاوەڕێی گۆڕانی هەلومەرجی دەروبەر و هەنگاوهەڵگرتنی کەسانی دیکە ببین. ئایا بۆ دەست پێکردنی ئیشی دڵویستی خۆمان دەبیٚ ئەوەندە چاوەڕوان بین تاکوو هەواڵی مەرگی بەمنزیکانەی خۆمان لە دوکتۆر ببیستین؟

## ئەگەر ئاواتەکانی من، دەستپێڕاگەیشتنی نەبێت، چی؟

مرۆڤەکانی ئیشی سەیر و لەباوەڕ بەدەر دەکەن. راجر کرافورد وەبیر بهێننەوە پیاوکێك بە قاچێك و دوو باڵ، نەك دەست، هاتە دنیاوە و بوو بە یاریزانێکی ئاکادمی تنس و لە رێگای فێرکاری تنسەوە ژیانی بەڕێوەدەبرد. ئێوە دەتوانن بەسەرهاتی ژیانی ئەو لە کتێبێکی خۆیدا بە ناوی "یاریکردن بە ئامرازی دڵ" بخوێننەوە. خوێندنەوەی بەسەرهاتی ژیانی راجر واتان لێدەکات کە بەربەستەکانی خۆیان لە سووچێکی ترەوە سەیر بکەن. دیجیتاڵ دەن دارتاشێکی ئەمریکی بوو کە بەهۆی تووشی بوونی بە نەخۆشی شێرپەنجە، قوڕگی خۆی لەدەست دا. دوای ئەو رووداوە دەن بۆ قسەکردن، وشەکانی بە کەمپیوتەرێکی بچووك ئەدا و کەمپیوتەرەکە لەجێی ئەو قسەی دەکرد. لە نێوان ئەو کەسانەی کە بەئاوات گەیشتنیان مسۆگەر دەکەن چاولێکردنێکی هاوبەش هەیە و ئەوەش ئەوەیە کە ئەوان رێگای خۆیان لە قووڵایەتیەوە دەست پێکردووە. لەم ناوەدا نەخۆشانێك دەدۆزنەوە کە تووشی ئاسم بوون و لە بەشە جیاوازەکانی وەرزش دا، قارەمانێتیان بەدەست هێناوە. تەجاری زۆر دەبینن کە لە مایەهیچەوە بێرە گەیشتوون و بەسەرهاتی هەزاران پەنابەر ناپاسایی دەبیستن کە تا رادەی سەرووترین قۆناخی ئیش و خوێندن سەرکەوتوون. کاتێك کە گشتێك لە کێشەکان لەبەرامبەر مرۆڤ دا خۆدەنوێنن ئەو بۆ رووبەڕوو بوونەوە و مانەوە، جۆرێك وەستاوی و هێزی ئیرادەی فیکری لە خۆیدا درووست دەکات و هەر ئەم هێزەیە کە بەچەکی شاراوە و پڕنهێنی ئەو دەبێت.

## کورتەی وتە

بۆ ئێمە بەردەوام مافی هەڵبژاردن بوونی هەیە. ئەگەر ئیشێك ناکەن هۆکاری ئەوەیە کە وزەی خۆتان لە جێگایەکی دیکە دانەوە. باس لەسەر بوون مەجالی بوون یان نەبوونی ئیش نییە، مەسەلەی بنەڕەتی هەبوون و نەبوونی مەیل بەرامبەر بەو ئیشەیە.

کاتێك کە دەڵێین: "من ئەم ئیشە دەکەم و هەموو دژواریەکانی بەگیان دەکڕم" ئەوکاتە کە هەموو شتێکی ئەم جیهانە بۆ پشتیوانی لە ئێوە هەڵدەستێت.

چاوەڕوانی ئەوە مەبن کە خوا
لە ئاسمان بێتە خوارێ و ئیجازەی
سەرکەوتن بەئێوە بدات.

ئەو کەسەی کە دەبێ ئیجازە دەربکات،
خودی خۆتانن.

# بەشی حەوتەم

## لە شوێنێکەوە دەست پێ بکەن!

## بوێری

## شێوازی نوێ تاقی بکەنەوە

## رازی توانا

## بۆچی ئێوە نا؟

### لە شوێنێکەوە دەست پێ بکەن!

((زاناکان بە کردەوە ژیان دەکەن نەوەك بە بیرکردنەوە لە کردەوە))

((کارلۆس کاستاندا))

((ئێوە ناتوانن بە مەبەستی کردنی ئیشێك ناوبانگ دەرکەن))

((هنری فۆرد))

ئایا تا ئێستا لەگەڵ ئەم دیمەنە بەرەوڕوو بوون؟ لەماڵەوە یان شوێنی ئیش لەپشت مێزەکەتان دانیشتوون کە تەلەفون زەنگ لێدەدات. هاوڕێیەك ئەیەوێت ژمارە تەلەفونێکتان پێ بدات: "تکایە یەك دەقە راوەستە قەڵەمێك بدۆزمەوە." بۆ دۆزینەوەی قەڵەم دەست دەکەن بە ژێروژوور کردنی شت و متی سەر مێزەکە.... یەك دنیا فایل، بلیتی تەیارە، پاکەتی پیتزا، دیعایەی بیمە، پارەی ئاسن، قەڵەمی (ماژیك)

منداڵەکە! خۆیەتی! ماژیك! ژمارە تەلەفوونەکە بە رەنگی زەردی روون کە ناخوێندرێتەوە دەنووسن و تەلەفوونەکە دائەخەن. دواتر لەگەڵ خۆتان دەڵێن: "ئێستا کە دیعایەی بیمەکانم دۆزیوەتەوە باشتر وایە بیخەمەنێو فایلێکەوە. فایلێکیش بۆ بلیتی تەیارە جیابکەوە، کوپەکانی قاوەش بخەمە قاپشۆریەکەوە... سەیر دەکەن خەرکی ئیش کردنن. قەڵەم و کاغەز بۆ قەفەسەکەی سەرەوە، پاکەتە بەتاڵەکانی پیتزا بۆ زبڵدان، کتێبەکان بۆ کتێبخانە و .... ئێوە تەنانەت دەستسڕ دێنن و تەلەفونن و مێز و... هەموو خاوێن دەکەنەوە. لەناکاو وەئاگا دێنەوە و بەخۆتان دەڵێن: "منیش دەتوانم شوێنکارێکی خاوێنم هەبێت." هێزێك لە دەروونتان دا پێك دێت و دەستبەجێ بەرنامەریزی دەکەن: "فایلی تازە بە بەرچەسپی نوێ دابین دەکەم. بۆ قەڵەمەکان شتێکی تایبەت دەکرم. تەنانەت هەموو حەوتوویەك زبڵدانکە دەرێژم!" ئێستا ئێوە ئەرکێکتان لەسەرشانتان ناوە کە زۆر لە دۆزینەوەی قەڵەمێك گەورەترە. ئێستا لە بیری دروست کردنی خاوێنترین شوێنکاری دنیا دان! تا نیوەی شەو، دوو سێ جێن قەڵەم پەیدا دەکەن بەڵام ئایا بایەخی هەیە؟ نە! چێژی ئیشەکە بە گسکی کارەبایی زۆر زیاترە بووە.

ئەم بنەما کە ناوی "بنەمای خاوێنی شوێنکار"ی ناو دەنێین لە بوارەکانی دیکەش وەکوو نووسینی راپۆرت، واسڵ کردنی زەریبە، شووردنی ئۆتۆمۆبیل و ...یش بەکار دێت. سەیر لێرەدایە کە ئێمە کاتێك کەیفخۆش دەبین کە ئیشەکەمان دەست پێکردبێت. ئەوەندە بەسە کە بەبێ هیچ پێشەکیەك ئیشە دەست پێبکەن بۆ ئەوەی هەست بە وزەی و شادی لە دەرونتان دا بکەن، بەلام ئێمە بەزۆری بەهەڵە دەڵێین: "کاتێك کە وزەی پێویست بەدەست بهێنم وەرزشی بەیانیان

دەست پێ دەکەم!" نە! سەرەتا دەبێ وەرزش دەست پێ بکەن. "کاتێک حەزی زیاتر بەدەست بهێنم وانەکانم ئەنجام ئەدەم." هەڵەیە. "کاتێ وزەم هەبوو کاسبیەکی بچووک بۆ خۆم رێدەخەم." نە!

وزەی و ئامادەیی بۆ هەر ئیشێک، کاتێک بەدەست دێت کە دەستمان پێکردبێت. وزە، ئەنجامی کۆنتاکتی ئێوە لە ئیشەکە دایە. گرنگ، دەست پێکردنە. خاڵێکی دیکە سەبارەت بە دەست پێکردن.... ئێوە بۆ دەسپێکی هیچ ئیشێک ئامادەیی تەواو پەیدا ناکەن! بۆ نموونە: ئایا ئێوە هیچ کات بۆ وتارخوێنی لە نێو کۆمەڵێکدا توانیوتانە بە ئامادەیی سەدلەسەد بگەن؟ نە. گرنگ نییە کە چەند جار وتارەکەتان نووسیوەتەوە یان چەندە کاتتان بۆ فێربوونی تەرخان کردووە، لەهەر حاڵدا بەخۆتان وتووە "تەنها ئەگەر کەمێک کاتی زیاترم دەبوو..." نموونەی دیکە، هاوسەرگیریە ئایا هیچ کات ئامادەیی تەواوتان بۆ هاوسەرگیری و قبوڵ کردنی هەموو هات و نەهاتە چاك و خراپەکانی بووە؟" هیچ کات! باشترین رێگا ئەوەیە تائەو جێگای کە دەتوانن خۆتان ئامادە بکەن و هەناسەیەکی قوڵ هەڵکێشن و دڵ لە دەریا بدەن.

یادگار دەڵێت: " ئێوە گەرەنتی بە من ئەدەن تاکوو من ئیشەکەم دەست پێ بکەم." نە یادگار! تۆ بەڵێن ئەدەی کە ئیشێک ئەنجام بدەی، تا ئەو جێگای کە دەتوانی خۆت ئامادە دەکەی و دواتر بە بێ هیچ گەرەنتیەك و بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداش بکەی ئیشەکە هەرلەوێوە دەست پێدەکەی.

## کورتەی وتە

مرۆڤ دوای دەست پێکردنی هەر ئیشێك، هۆکاری پێویست وەدەست دێنێت. دانیشتن و گەلاڵەی دارشتن بۆ دەسپێك، بێ سوودە. حەز و

ڕاکێشان، ئەنجامی جووڵەیە و بەهۆی جوڵەوەیە کە هەل و چۆنیەتیە نوێکانی خۆ دەردەخەن. دڵتان بدەن لە دەریا.

## باوەڕتان بەخۆتان هەبێت

هەموو دەروونناسەکان دەڵێن کە ئێمە دەبێ ئیمانمان بەخۆمان هەبێت و ئەمە بەتەواوی مەنتیقە. بەڵام پێش لەوەی کە ئیمان بەخۆ بێنین دەبێ باوەڕ بە وتەکانی خۆمان بکەین.

کاتێك باس لە وەعد و بەڵێنی دەکرێت زۆربەی مرۆڤەکان لاواز و بێ ئیرادە دەبن. دەڵێن فلان ئیش ئەنجام ئەدەن بەڵام نایکەن. وەعدی یارمەتیتان ئەدەن بەڵام بۆ ماسیگیری دەڕۆن. بەڵێن ئەدەن کە قەرزەکانیان بدەنەوە بەڵام هەواڵیان لە هەندەرانەوە پێمان دەگات و ئەوکاتە لایان سەیرە کە بۆچی ژیانیان کارامەیی پێویستی نییە. تەنها ئەو بەڵێنە قبوڵ بکەن کە توانایی بەڕێوەبردنیتان هەیە. ئەگەر پێویست دەکات کەمتر وەعد بدەن و بەڵێنی کەمتر بەڵام ئەگەر ئاوەهاتان کرد لەسەر وەعد و بەڵێنی بمێننەوە. بەرەبەرە وەعدی ئێوە، دەبێتە یاساتان و ئەوکاتە کە بەڕاستی ئیمانتان بەخۆتان دەبێت.

## بوێری

((ئاسایش، لە چوارچێوەی خزمەتگوزارێك دا دێتە پێشەوە و دەبێتە ئەرباب.))

((کهلیل جیبران))

مرۆڤەکان لە گۆرانی خوێندن لە ژێر باراندا، شیعر دەهۆننەوە بەڵام لە ژیانی واقیعی دا کاتێ کە تەڕ دەبن بۆڵەیان دێت. خەڵکی لە سەیر

کردنـی بەسـەرهاتەکانی "ئینـدیانا جـونجز" و ئـەو ڕەنجانـەی کـە لـە تێپەڕکردنی ئەشکەوتی پڕ لە مار و جاڵجاڵۆکەدا قبوڵی دەکات چێژ دەبەن. بـەڵام کـاتێ سیـستەمی فێنکـی شـوێنکارەکەیان ئیش ناکات خۆیان دەکوڵێن. لەوانەیە ئەگەر ئەم هەمووە بەسەرهاتە جۆراوجۆرەمان لە سینەما و تەلەفزیۆن دا نەدەبینی لە ژیانی واقیعی دا زیاتر بەدووی ڕووداو و جووڵەدا دەگەڕاین.

مرۆڤـی ئـەم سـەردەمە، نرخـی لـە ڕادەبـەدەری بـۆ "ئاسـوودەیی و ئاسـایش" دانـاوە. بەشـی زۆری دڵـەڕاوکێ و نیگرانـی ئێمـە لـەم خووگرتنـە بـە ئاسـاش و ئاسـوودەیە سەرچاوە دەگرێـت. "بەرنامـەی ڕۆیشتنی تەیارەکان بەردەوام دەبێ ڕێكوپێك بێت. هەڵگرتنی بار دەبێ بەردەوام ئاسان بەڕێوەبچێت. ناردنی حەواڵـەی بانکی دەبێ ئاسان و بەبێ کات و پێشوازی بێت."

ئاسـوودەیی لـە ڕادەبـەدەر، نەخۆشـی و مانـدوویی وەبـار دێنێـت. پـڕ کردنی مێشك لەم دەبێ و نابێتانـە دەبێتـە هۆی ڕاکت بوونی مێشك. هەرچـی کـەمتر بـۆ شـێوازی ژیـان و هەسـتەکانتان، یاسـا دابنـێن ئاسـوودەتر دەتـوانن لـە بەرامبـەر ڕووداوەکانـدا کردەوەتـان هـەبێت. هـەموو کەسـێك لـە ئێمـە لـە ژیانـدا لەگـەڵ کۆمـەڵێ ڕەقـی بـەرەڕووو دەبینـەوە، ڕەخنـەمان لـێ دەگیرێـت، دوور دەخرێینـەوە، مانـدوو و بـێ پـارە دەبـین. کاتێـك ڕۆژە خراپـەکان دێنـە ئاراوە وەکـوو بەشـێك لـە پرۆسـەی ژیـان قبـوڵی بکـەن. هـەرجۆر بێـت، ژیـان گـۆڕانی دەوێـت! خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە کارامەیی بوێری بەزۆری لە زیرەکـی زیاترە و ئەمە دەبێتە هۆی ئازاری کەسانێك. یادگار دەڵێت: "من زۆر زیرەکـەم، دوو شەهادەی زانکۆم هەیە و ناتوانم باوەڕ بکەم کە ئەو کەسانەی لەمن

زیرەکتر نین، ئیش و داهاتیان لەمن زیاتر بێت." ئەم مەسەلە وەکوو بنەمایەك قبول بکەن: "پاداشەکان بەردەوام هی کەسانێکە کە یان ناوبانگی خۆیان خستۆتە مەترسیەوە، یان پارەی خۆیان و یان هەردووکی.

## کورتەی وتە

بوێری، بەمانای نەبوونی ترس نییە. بوێری، کردەوەیە سەرەڕای هەبوونی ترس. ئەو کەسانەی کە لە ژیاندا هیچ ئیشێك ئەنجام نادەن درووست بەئەندازەی ئەوکەسانەی کە دەست ئەدەنە کاری مەترسیداری گەورە دەترسن. تەنها جیاوازی ئەوەیە کە گروپی یەکەم لە شتی بچووك و لاوەکی دەترسن. ئێستا کە بڕیار لە ترسانە بۆچی لە شتی گەورە نەترسین؟

((ئایا تەنها لەو کەسانەی کە ئافرینیان وتووە و دڵسۆزتان بوون دەرستان وەرگرتووە؟ و ئایا لەوکەسانەی کە دووریان خستونەتەوە و رووبەڕووتان وەستاون دەرستان وەرنەگرتووە؟))

((والت ویتمەن))

هەڵخڵەتاندن ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی لە گەمارۆی هاوڕێ و هاوکارانێك دا ببینێتەوە کە قسەی دڵویستی ئەو و پەسەندی دەکەن. بەم پێیە کاتێك بارودۆخ تێك دەچێت لانیکەم کەسانێك هەن کە پێی بڵێن: "تاوانی تۆ نییە!" بەڵام چەند چاکە کە کەسانێکیش هەبن کە بۆ خەبات هانمان بدەن.

## هەڵوێستتان هەبێت

(( ئەگەر هەست دەکەن کە کەوڵ کراون لەوانەیە هەرواش بێت!"

((چین نینگ چو))

پێڕەوی لە دڵ بەمانای نەرمی نییە. دونیا شوێنێکی تووڕە و زبرە و یاساکانی سرووشت یاساگەلێکی موحکەم و جیدیە. بەرخی لاواز، دەبێتە خواردنی ڕێوی و چارەنووسی مرۆڤە لاوازەکانیش جیالەمە نییە! ئەگەر لاواز بن ڕێوی سیفەتەکان ئێوە وەکوو ئامانجێکی ئاسان دەناسن و ڕاوتان دەکەن.

((ڕۆژێك بۆقێك لای ئاوێك دانیشتبوو دووپشکێك هات و وتی: بەڕێز بۆق، من ئەمەوێت لەم ئاوە بپەڕمەوە بەڵام مەلە نازانم ئەتوانن یارمەتیم بدەن و من تا ئەو پەڕ ئاوەکە لەسەر پشت خۆتان بەرن؟

بۆقەکە وتی: "بەڵام تۆ دووپشتکی و دووپشك بە بۆقەوە ئەدات!"

دووپشك وتی: "بۆچی پێتەوە بدەم من ئەمەوێت بگەمە ئەو بەرەوە!"

بۆق قبوڵی کرد.

ڕێك گەیشتبوونە نیوە ڕێگا کە دووپشك، بە بۆقەکەیەوە دا. بۆقەکە لە حاڵێکدا کە لەتاو ئازار پێچی لەخۆی ئەدا و دوایین هەناسەکانی هەڵئەکێشا وتی: "بۆچی ئەم ئیشەت کرد؟ ئێستا هەردووکمان دەخنکێین!"

دووپشك وتی: "ئاخر من دووپشکم و دووپشکیش دەبێ بە بۆقەوە بدات!"

ئاگاداری دووپشکەکان بن! لە دەوروبەری ئێوەدا کەسانێك هەن کە خنکان بۆیان گرنگ نییە بە مەرجێك ئێوەش لەگەڵ خۆیان بکێشنە خوارەوە.
لە برێك کەس دەبێ دووری بگرن و لە بەرامبەر برێك کەسیشدا دەبێ بوەستیت و شەڕ بکەی. چ کات دەبێ هەڵوێستمان هەبێت؟ ئەوەندە بەسە پرسیار لەخۆتان بکەن: "ئایا هەستی من، هەستێکی دادوەرانە و ویژدانیە؟" ئەگەر ئاوەهایە هەڵوێستان هەبێت لەخۆتان داکۆکی بکەن و بایەخ بەوە مەدەن کە خەڵکی سەبارەت بە ئێوە چ دەڵێن.
ئێمە دەتوانین بۆ راکێشانی میهرەبانی و هاوڕایی کەسانی دیکە، خۆمان لەژێر پێ بنێین و لە مافی خۆمان چاوپۆشی بکەین بەلام لەدوایدا سەیر دەکەین کە جیالەوەی میهرەبانیمان بەدەست نەهێناوە بەڵکوو کەسایەتی واقیعی خۆشمان دۆڕاندووە. لەکۆتاییدا چارەسەرێك نامێنێتەوە جیالەوەی کە بەپاڵپشتی رێبەری دەرونی خۆمان و یان بە واتایەکی باشتر، پێڕەوی دڵی خۆمان بین.

## شێوازە نوێکان تاقی بکەنەوە

((ئەگەر هەر ئەو ئیشە دەکەی کە بەرداوم کردووتە، هەر ئەو شتەش بەدەست دێنی کە بەردەوام بەدەستت هێناوە.))
لە مرۆڤە بوێرەکان پرسیار بکەن کە بوێری کرینی بەش، دەسپێکی تەجارەتێکی نوێ، وەلانانی ئیشی پێشوو، سەفەر بۆ وڵاتە جۆراوجۆرەکان و بەشێوی گشتی، هەر ئیشێکی نوێیان چۆن وەدەست هێناوە؟ بەتەئکید ئاگاداری روانگەی هاوبەشی هەموویان دەبن. ئەوان

پرسیاریان لەخۆیان کردووە: "دەتوانم لە خراپترین هەلومەرجیشدا ئەم ئیشە بکەم؟" و کاتێک کە وەڵامی بەڵێ دەبیستن دڵیان بەدەریا داوە. و ئەمە رازی ریسك کردنە گەورە و بچووکەکانە.

نموونە: شاخەوان بۆ کڕینی خانوویەك لە گومان دایە. لەخۆی دەپرسێت: "خراپترین حاڵەت کە لەوانەی بێتە پێشەوە چییە؟"

وەڵام: لەوانەیە ئیشەکەم لەدەست بدەم و بەزەرەرماڵەکە بفرۆشم. لەوانەیە هەموو پاشەکەوتەکەم لەناوبچێت و ناچار ببم سەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە. شاخەوان بەخۆی دەڵێت: " لە سفرەوە دەسپێکردنەوە، سەخت و بەئازارە بەڵام من توانایم هەیە." خانووەکە دەکڕێت.

نمونە: کارۆ ئەیەوێت داوای خۆشەویستی لە سارا بکات. لەخۆی دەپرسێت: "خراپترین حاڵەت کە ئەگەری چاوەڕوان کردنی هەیە چییە؟"

وەڵام: "لەوانەی قتووی ساردیەکەیم تێ بگرێت. بەڵام من بەم هەڵسوکەوتانە خووم گرتووە." کارۆ پێشنیارەکەی دەخاتە روو.

نموونە: سەمیرە دەیەوێت واز لە بەشی پزیشکی بهێنێت و ئاسارناسی بخوێنێت. لەخۆی دەپرسێت: "خراپترین حاڵەت کە ئەگەری پێشهاتنی هەیە، چییە؟"

وەڵام: "لەوانەیە باوکم لەتاو تووڕەیی، سەری خۆی لە دیوار بدات. لەوانەی هاورێکانم پێم بڵێن شێت بووە. لەوانەی ناچار ببم دوونەوەندەی ئێستا خوێندنەوەم هەبێت." سەمیرە بەخۆی دەڵێت: "ئەگەر هەموو ئەم رووداوانەش روو بدات من هەر دەتوانم." سەمیرە، بەشەکەی دەگۆڕێت.

## کورتەی وتە

ئەوەی کە لەخۆمان پرسیار بکەین: "خراپترین حاڵەت کە ئەگەری پێشهاتنی هەیە، چییە؟" پیشاندەری روانگەیەکی نگەتیڤ نییە. گەلاڵەی ئەم پرسیارە، شێوازێکە بۆ ئەژماردنی رادەی بەڵێنی و جیدی بوونتان. ئەوەندە بەسە کە ترسە ئیبهامیەکانتان وەلا بنێن و لە جێگایان ئەگەری تایبەت کە لەوانەیە لە خراپترین حاڵەتدا شتە چاکەکان روویدات، دابنێن. لەسەر ئەم ئەساسە، دڵ لە دەریا دان، چاکی دیکەشی دەبێت.

## رازی هێز

((تەقەکەرێك کە بێ ئامانج تیر دەهاوێت شارەزای هەموو لێزانیەکانە. کاتێ ئیشەکە بە جیدی دەگرێت دەستی دەلەرزێت. کاتێ باس لە خەلات دەکرێت، دەترسێت. ئێستاکە زیاتر بیر لە بردنەوە دەکاتەوە و هەر ئەم پێویستی بە بردنەوەیەیە کە هێزەکەی وشك دەکات.))

((چوانگ تسۆ))

ئەگەر تا ئێستا راکتتان بە دەستەوە گرتبێت یان گۆلێکتان کردبێت بەتەئکید دەزانن کە مەسەلەی وەرزش لە یاری سەرترە. ئەوەی دەبێتە هۆکار کە مرۆڤە جیاوازەکان لە شۆفیری ئۆتۆمۆبیلەوە تاکوو دوکتۆری مێشك و بەرپرسی پرسگە، پشووی کۆتایی حەوتوو لە یاریگەدا بەسەر بەرێت بەتەئکید لە تەنها یاری کردن سەرترە. لە پشت مێزی تنس، لە زەوی بەدمینتۆن و لە پیستی خلیسکێندا، ئێمە یاساکانی ژیان فێری

خۆمـان دەكـەين. وەرزش، جیـا لـەوەی چـێژێكی فراوانمـان پـێ دەبەخشێت مامۆستایەكە كە هێزە ئاگەكسیەكانمان وەبیر دێنێتەوە.
بڕێك لە شتەكان كە فێر دەبین بەمشێوەیەن:

## لە ئێستادا ژیان بكەن

تـەنها كاتێك دەتـوانین باشـترین یـاری پێـشكەش بكـەین كـە لـەنجامی یاریەكـەمان لـەبیر كردبێـت و هـەموو تـەركیزمان لەسـەر ئێـستا بێـت. هەرچـی كـەمتر بـیر لـە بردنـەوە بكـەین و كـەمتر نیگـەرانی داوەری كەسانی دیكە ببین یاریەكی باشتر پێشكەش دەكەین.

## ناچاری قەت كارساز نییە

هێزی واقیعـی كاتێك دەردەكەوێت كە ئێوە ئاسوودە بن و هەست بە پێویستی سەلماندی هێزتان نەكەن. ئەم خاڵە لە بواری بەڕێوەبەرێتی سەرچاوە مرۆڤایەتیەكانیشدا بەتەواوی دەگونجێت.

## لەسەرخۆ بن

توورەیی قەت كارساز نییە. ئایا هـەرگیز یاریزانی گوڵفتان بینیوە كە توورە بێت؟

## بەجێگەی رق لە بەرامبەری سەروتردا، لێزانی خۆتـان زیـاد بکەن!

رق و رقەبەرایـەتی، وزەی ئێـوە لـەناو دەبـات و مێـشکتان لـە ئامانجـە سەرەکیەکان، بەلاڕێ دەبات.

## ئەگەر وادەزانن کە هەموو دونیا لە بەرامبەر ئێوەدا وەستاوە، هەروەهاش دەبێت

سەرزەنشت کردنی کەسانی دیکە، چارەسەر نییـە. کـاتێ بـەو ئەنجامە دەگەن کە هـیچ ئیـشێك وەکـوو خـۆی بـەڕێوە ناچێت و دادوەر و تۆپ و با، هەر هەموویان بەدژی ئێوەن پـراکتیکیش ئاوەهـای لێدێت. یاریزانە سەرکەوتووەکان، رێك وەکـوو هـەموو مرۆڤـە سـەرکەوتووەکان، کـەمترین لێپرسراوی قبولْ دەکەن و هەرگیز لەبەر شکستەکانیان، دایکـی خۆیان سەرزەنشت ناکەن!

## سەرچاوەی یـاری سەروئـاسایی، بەڵێنی سەروئـاساییە.

بینەرێکی ئاسایی لەوانەیە لێزانیـە سەروئاساییەکانی مایکل جۆردەن یان ئـستفی گـراف بـە سروشـتی و زگمـاکی بزانێـت. بـەلأم زۆرکـەس بە بلیمـەتی و توانـای سـەیرەوە لـەدایك دەبـن. ئەگـەر بـە وردبینانـە سـەیربکەین ئاگـادار دەبـین کـە هۆکـاری سـەرەکی گەشـانەوەی ئـەم ئەستێرانە ئەوەیە کە ئەوان زیاتر لە خەڵکی، خۆیان بەڵێندار کردووە.

## چ لـــه وەرزش و چ لـــه ژیانـــدا، بـــەردەوام دەبـــێ لەســـەر خواستەکانتان تەرکیز بکەن.

کاتێ بیر لە شتگەلێك دەکەنەوە کە حەزتان لە ڕوودانی نییە بۆ نمونە لە گۆڵ خواردن یان هەڵە کردن، هەرئەوانەش روو ئەدەن! بۆچی؟ مێشکی مرۆڤ بەپێی ئەو وێنانەی کە پێی دەدرێت کار دەکات. بەخۆتان دەڵێن: "تۆپەکە بکەرە گۆڵـەوە!" و وێنەیەك کە بەمپێیە بە مێشکی خۆتان ئەدەن وێنەی تۆپێکە کە چۆتەوە گۆڵەوە و مێشکی ئێوە تەنها بەپێی ئەم وێنەیە کە پێتان داوە کار دەکات، تـۆپ دەچێتە گۆڵـەوە و هۆکارەکی خودی خۆتانن!

ترس، بکوژی مرۆڤە. چ لە وەرزش، چ لە چاوپێکەوتنێکی وەرگرتن دا و چ لە ماوەی وتارخوێنی دا. کاتێ خڕدەبنەوە لەسەر شتگەلێك کە لێی دەترسن هەر ئەم وێنە مێشکیانە کە خۆتان دروستتان کردووە، راستەوخۆ ئێوە بەرەو ئەو کارەساتە دەبەن. لەسەر خواستەکانتان خڕ ببنەوە و نەوەك لەسەر ترسەکانتان.

## کورتەی وتە

هەموو منداڵان دەبێ مەجالی وەرزش کردنیان هەبێت لەبەر ئەو دەرسانەی کە فێردەبن و نەوەك لەبەر ئەو خەڵاتانەی کە وەریدەگرن. وە یەکێك لەم دەرسانە ئەوەیە کە: "گرنگ نییە لەکوێوە دەست پێدەکەن گرنگ ئەوەیە کە چۆن کۆتایی پێ بهێنن."

## بۆچی ئێوه نه؟

((کاتێ منداڵ بووم وامدەزانی کە کەسانی گەورە وەکوو ئسقفەکان و کاردینال یان ژنەڕاڵەکان و سیاسەتمەدارەکان بەڕاستی دەزانن کە لەم دونیایەدا چی روو ئەدات؟ ئێستا من لەشوێنی ئەواندام و ئێستا دەزانم کە ئەوانیش نەیاندەزانی."

((دەیڤید ماهانی))

کاتی منداڵی بەزۆری دەچووومە لای بنەماڵەی زرنر، کە لە هاوڕێیانی بنەماڵەیی ئێمە بوون. ئەوان بەردەوام لە سەلاجەکەیاندا، کوکاکولایان هەبوو. (دایکم دەیوت هۆی ئەوەیە کە ئەوان دەوڵەمەندن ئێمە لە ماڵی خۆماندا ئاومان دەخواردەوە). لەسەر ئەم ئەساسە من وایتێگەیشتم کە "هەرکەس کە کوکاکولای هەبێت بەڕاستی بەهەموو شتێك گەیشتووە." دوای ماوەیەك کوکاکولاش گەیشتە سەلاجەکەی ئێمە و جائەوکات تێگەیشتم کە کوکاکولا هیچ کەس بەرز ناکاتەوە.

ماوەیەك بەوجۆرە بیرم دەکردەوە کە کەسی سەرکەوتوو ئەوکەسەیە کە جلوبەرگی فەرمی لەبەر بکات و بەردەوام کراوات ببەستێت. باوکی من تەنها لە پرسانەدا کراواتی دەبەست و بەڕای من ئەمە بەس نەبوو. بەڵام دواتر تێگەیشتم کە کراوات بەستن پسپۆڕی ناهێنێت کاتێ گەیشتمە

تەمەنی دوانزە ساڵان دڵم دەیویست ببمە سەرۆك وەزیری ئوستورالیا چونکە وامدەزانی کە سەرۆك وەزیران، عەقڵیان تەواوە.

تا ئەوکاتەی کە دەستم بە نووسینی کتێبەکە نەکردبوو وامدەزانی کە نووسەرەکان دەبێ هەموو شتێك بزانن. لەوانەیە ئێوەش، جاربەجاری بیرکردنەوەکانی منتان هەبووبێت. لەوانەیە ئێوەش وابیردەکەنەوە کە کەسانێك هەن کە وەڵامی هەموو پرسیارێك دەزانن. بەڵام ئاوەها کەسانێك هێشتا لەدایك نەبوون. مرۆڤە سەرکەوتووەکان، لەسەرو مرۆڤەوە نیین. ئەوانیش وەکوو من و ئێوە بەزۆری یەك مێشك و دوو دەست و دوو پێیان هەیە و شەو و رۆژیان هەر ئەو بیست‌وچوار کاتژمێرەی من و تۆیە. ئەوان لێزانیەکانی خۆیان پەروەردە کردووە و دواتر پێشکەشیان کردووە. ئێوەش هەروەها بکەن.

## کورتەی وتە

هیچکەس بە ئیجازەی تایبەتەوە بۆ سەرکەوتن لەدایك نەبووە. خوا لە ئاسمانەوە ناهێتە خوارەوە بۆ ئەوەی بڵێت: "ئێستا سەرەی تۆیە." خوا ناڵێت: " تۆ ناتوانی" یان "تۆ ئەتوانی" ئەمە تۆ دەڵێیت!

## کاتێ شاگرد ئامادە بێت....

((کاتێك شاگرد ئامادە بێت، مامۆستا دێتە پێشەوە.))

کاتێ بڕیاری تەواو بۆ گۆڕینی ژیان یان گەیشتن بە ئامانجێك دەدەن کەرەستەی پێویست بەخودی خۆی دێتە دێتە پێشەوە: هاوڕێکانتان کتێبتان بەقەرز پێ ئەدەن، ئاگادارییەکان سەرنجتان رادەکێشن، لەگەڵ مرۆڤە جۆراوجۆرەکاندا بەرەڕوو دەبن و ئێوە واهەست دەکەن کە هەموو شتێك بەوجۆرە بەرەوپێش دەڕوات کە دەتانەوێت.

ئایا مەبەستی من ئەوەیە کە ئێوە بەرامبەر بە سەرکەوتن و هەلەکان هوشیاری زیاتر پەیدا دەکەن و یان بەڕاستی بەرەو خۆتان رایدەکێشن؟ هەر دوو. نۆزدەیەمی ئۆکتۆبری ١٩٨٣م بەباشی وەبیر دێت. لەورۆژەدا بڕیارم دا کە بەهەر نرخ و بەهایەك بێت ژیانی خۆم بگۆڕم و زۆرشادتر لە بیست و پێنج ساڵی رابردوو، ژیان بکەم. سێ رۆژ دواتر، بەبێ هیچ هۆکارێك، شەپۆلی رادیۆکەم لەسەر وێستگەیەك دانا کە تا ئەورۆژە هەرگیز گوێم لێ نەگرتبوو و لەوێوە هەواڵی سمینارم بیست. لەو سمینارەدا بەشداریم کرد و، خاڵی چەمانەوەی ژیانم بوو.

ئەم بەسەرهاتە، شتێکی سەیر نییە. لەم رووداوانە زۆر روو ئەدات ئستارتی بنەڕەتی، بەڵێنە و مانای بەڵێنی ئەوە نییە کە تەنها ئاواتی شتێکمان هەبێت. بەڵێنی، مانای بڕیاری قووڵی دەروونی بۆ ئەنجامی کار، سەرەڕای هەبوونی هەموو لەمپەرەکان.

## کورتەی وتە

کاتێ بڕیاری ئەنجام دانی ئیشێك ئەدەین کەرەستەی پێویست بەخودی خۆی دابین دەبێت. لەوانەیە هەموو ئەم شتانە بە ڕێکەوت بزانین بەڵام بە روانینێکی وردترەوە ئاگادار دەبین کە ڕێکەوتێك لە ئارادا نییە چونکە ئەمە ڕێکەوتێکە کە بەردەوام روو ئەدات.

ئەگەر لەگەڵ ژیان شەڕ بکەن،
بەردەوام دەدۆڕێن.

ئەگەر بەدووی ئارامی مێشك دان
لەسەر پێشهاتەکانی ژیان مۆرکی
"چاك" یان "خراپ" دامەنێن.

# بەشی هەشتەم

بەخت و ناوچاو

بیرکردنەوەکان

ئارامی خەیاڵ

وێنەی تەواو

## بەخت و ناوچاو

لە رۆژگارە کۆنەکاندا پیرەپیاوێکی لادێیی بووە کە خاوەنی کوڕێك و ئەسپێك بووە. رۆژێك ئەسپی کابر هەڵهات و هاوسێکانی بۆ سەرەخۆشی چوونە لای و پێیان وت: "چ بەخت رەشی کە ئەسپەکەت هەڵهات!" پیرە لادێیی لە وەلاّم دا وتی: "لەکوێوە دەزانن کە لە بەخت رەشی بووە یان لە بەخت باشی؟" وە هاوسێکانی بە سەرسووڕمانەوە وتیان: "خۆ ئاشکرایە کە ئەمە بەخت رەشیە!"

هێشتا بیست رۆژ بەسەر ئەم رووداوەدا تێنەپەڕیبوو کە ئەسپی کابرا لەگەڵ بیست ئەسپی وەحشی(کێوی) بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. ئەمجار هاوسێکان بۆ پیرۆزبایی هاتنە لای پیرەپیاو: "چ بەختێکی چاکت هەیە کە ئەسپەکەت لەگەڵ بیست ئەسپی کێوی دا گەڕایەوە." پیرەپیاو

جارێکی دیکە وتی: "لەکوێوە دەزانن کە ئەمە لە بەخت باشی منە یان لە چارەڕەشی من؟"
سبەی ئەو رۆژە کوڕی کابرا پیرە لەکاتی سوارکاریدا لە نێوان ئەسپە کێوییەکاندا کەوتە خوارەوە و قاچی شکا. هاوسێکان جارێکی تر هاتنەوە: "چ بەختێکی خراپ!" وە پیرە کەشاوەرز وتی: "لەکوێوە دەزانن کە ئەمە لە بەخت باشیە یان لە چارەڕەشیم؟" وە چەند کەس لە هاوسێکانی بە تووڕەییەوە وتیان: "خۆ ئاشکرایە کە لە شانسی خراپی تۆ بووە پیرەپیاوی گێژی هیچ نەزان!"
چەند رۆژ دواتر هێزەکانی دەوڵەت بۆ عەسکەری هاتن و هەموو لاوە تەندرووستەکانیان بۆ شەڕ لە ولاتێکی دوورەدەست دا لەگەڵ خۆ برد. کوڕی کەشاوەرزی پیر بەهۆی قاچە شکاوەکەیەوە لە عەسکەری، عەفو کرا. هاوسێکان جارێکی دی بۆ پیرۆزبایی چوون بۆ ماڵی پیرەپیاو: "چ بەختێکت هەیە کە کوڕەکەت عەفو کرا!" وە کەشاوەرزی پیر وتی: "لەکوێوە دەزانن کە ....؟"
ئێمە دەتوانین هەموو تەمەنمان بۆ مۆرك لێدانی رووداوەکان تەرخان بکەین: "ئەمە چاکە، ئەوە خراپە..." بێ سوودە. هۆکاری ئەوەی کە مۆرکی بەلا و نەگبەتی ئەدەین لە هەموو رووداوێك تەنها ئەوەیە کە یەك لە سەدی گشت راستیەکە دەبینین.
تا ئەوکاتەی کە باوەڕتان بە خراپ بوونی بارودۆخ هەبێت، هیچ گۆڕانێك لە بارودۆخ دا دروست نابێت. تا ئەوکاتەی کە بە هاوار و شەڕ و مەرافێعاوە بۆ پێشوازی رۆژەکانی ژیانتان دەڕۆن هیچ پێشکەوتنێك لە ژیانتاندا نابینن. بەلام رێك ئەوکاتەی کە جۆری

روانگەی خۆتان بەرامبەر بە ژیان دەگۆڕن هەموو شتێك روو لەگۆڕان دەبێت.

وایدانێن کە مەبەستی سەفەر بە تەیارەتان هەیە و شوێنی ئێوەیان بە کەسێکی دیکە داوە دەڵێن: " بەڕاستی گاڵتەجاڕیە. من بەپەلەم. ئێستا هەموو چاوەڕێی من دەکەن. من دەبێت بەتەئکید بەم تەیارە بڕۆم." ئەگەر بەمجۆرە بیرکردنەوە و رووبەڕووبوونەوەوە کەسانی دیکە خۆی لێدان و قاوە رژایە سەر جل‌وبەرگتان، جانتاکەتان ون بوو و .... بەهیچ شێوەیەك لاتان سەیر نەبێت. ئەگەر لەگەڵ ژیان شەڕ بکەن بەردەوام دۆڕاون هەرکات بەخۆتان بڵێن: لە ژیانی مندا هیچ شتێك بەڕێکەوت روو نادات. ئەگەر لێرەم لەبەر ئەوەیە کە دەبێ لێرە بم، ئەوکاتەیە کە هەموو شتێك روو لە چاکبوون دەڕوات: لەوانەیە هەر لەکاتی چاوەڕوانی تەیارەی دواتردا هاوڕێیەکەی چاك پەیدا بکەن و یان هاوڕێیەکی کۆن ببیننەوە یان مەجالێك بۆ خوێندنەوە دەقۆزنەوە.

پاڵدان بە مەنتیقەوە، بەردەوام کارسازە. وایدانێن کە لە چاوپێکەوتنێکی وەرگرتن دا بەشداریتان کردووە و قبوڵ نەکراون. ئەگەر بەخۆتان بڵێن: "ئەو ئیشە مافی من بوو. من هەم هەل‌ومەرجی پێویستم هەبوو و هەم ئەزمونی تەواو، ئێستا ئیتر ژیانم لەناوچووە." بەم قسانە بەڕاستی خۆتان ناهومێد و بێ هیوا کردووە ئەم ناهومێدی و بێ هیواییە لەوانەیە حەوتوویەك بخایەنێت و لەوانەشە تەمەنێك. ئێوە دەتوانن بە سەلماندنێکی مەنتیقی زۆرباش بیسەلمێنن کە مافی ئێوە بووە بەلام ئەم باسانە، هیچ شتێك لەمەسەلەکە ناگۆڕێت چونکە ژیان، پێڕەوی مەنتیق نییە!

ئەگەر لەدووی ئارامی زیاترن لەسەر رووداوەکانی ژیان مۆرکی چاك یان خراپ لیٚ مەدەن. "دین بلك" لە یەکێك لە کتێبەکانی دا دوو بەسەرهاتی واقیعی گێڕاوەتەوە:

"ئەستێرەیەکی شانزە سالأنی یاری بەسکتبالٚ لە کارەساتێکدا هەردوو قاچی لەدەست دەدات." کوێرێکی زکماك، لە تەمەنی پەنجاودووساڵیدا، توانای بینین پەیدا دەکات." کیرت برینکمەنی یاریزان دەبێتە قارەمانێکی یاری کەمئەندامان. ئەو لە چاوپێکەوتنێکدا ئاوەها دەڵێت: "ئامانجی من تەنها ئەوە بوو کە لە کەمترین ماوەدا بە ئاوەها شوێنێك بگەم. من نازانم ئەگەر قاچم لەدەست نەدابوو ئێستا لە چ بارودۆخێکدا بووم؟ بەلأم ئێستا دەزانم کە چیم کردووە و ئەمەوێت چ بکەم و ئەمە زۆر سۆزدارە، رێك هەر ئەوشتەی کە بەدووی بووم."

وە گوێگرن لە کوێرێك کە دوای پەنجاودووساڵ، بە عەمەلیاتێك، توانای بینینی وەدەست هێناوە. ریچارد گریگوری، دەروونناسی ئەم کەسە دەڵێت: "ئەو لە کاتی کوێریدا ژیانێکی باشی هەبوو بەسەر ژیانی دا زاڵ بوو بەلأم کاتێ کە لەئەنجامدا، توانای بینینی وەدەست هێنایەوە، توانای بینین ناهومێدییەکی قووڵی لەگەڵ خۆ هێنا و مەرگی ئەو، لە ماوەیەك کەمتر لە یەك ساڵدا، لەتاو خەمۆکی رووی دا.

## بیرکردنەوەکان

ئەساسەن هەرکەسێك دەتوانێت لە دوو روانگەی جیاوازەوە سەیری دونیا بکەن:

" دنیایەکی گلأوە"

## دنیایەکی گلاّوە

ئێمە بۆ دۆزینەوەی عەیب و کەموکورتیەکانی کەسانی دیکە، وزەیەکی فراوان بەفیڕۆ ئەدەین و پێداگرانە لەوپەڕ تووڕەییەوە هەوڵ ئەدەین بیسەلمێنن کە مرۆڤەکان تووڕە، زۆرخۆر، هەڵەخەرج و دزن و ئەنجامی ئەم هەوڵ و ڕەخنانە چییە؟ هیچ، جیالەوەی کە ژیانی خودی ئێمە لە شادی و خۆشی خاڵی دەبێتەوە.

دەتوانین برسیەکانی کەلکەتە وەك نموونە بهێنینەوە و بڵێین کە دنیا ڕوولە وێرانی دەڕوات. بەڵام ئەمە دەتوانێت بیانوویەك بێت بۆ دەرچوون لەژێرباری بەرپرسیارێتی ژیان. ئەگەر ئێوە هیندی یان دانیشتووی کەلکەتە یان لەحاڵی یارمەتیدانی برسیەکان دا بن لەوانەیە دێڕی سەرەوە مانا بگرێت بەلاّم جیاواز لەمە دادوەری کردن لەسەر هەلومەرجێك کەلەم ماوەیەدا، زانیاریەکی ئەوتۆمان لەسەری نییە یارمەتی هیچ کەسێك نادات. هەڵبەت ئەگەر مەبەستی یارمەتیدانتان هەبێت بابەتەکە دەگۆڕدرێت بەلاّم لەم هەوڵ بێ وەستانە بۆ سەلماندنی خراپ بوونی دنیا هیچتان دەست ناکەوێت. دایکە ترزاکانی دنیا قڕوبۆڵە ناکەن کردەوەیان هەیە!

## دنیا بەمشێوەیەش، هەر جوانە

ڕێگای دووهەم قبوڵکردنی دنیا بەمشێوەیە کە هەیە. لەوانەیە پرسیار بکەن: "چ هۆکار و فاکتەرێکت بۆ چاکبوونی دنیا هەیە؟" هۆکار و

فاکتەر، پێویست نییە. دنیا هەر ئەمەیە کە هەیە. مانگ لە دەوری زەوی دەسووڕێت و زەوی، لەدەوری خۆر، گوڵی سوور دەپشکوێت، پلەوەرەکان دەچریکێنن، مرۆڤەکان زەماوەند دەکەن... و جیا دەبنەوە، هاوسێکان شەڕوشووڕ دەنێنەوە و... هەموو ئەمانە بەشێکە لە بەرنامەی گەورەی ئەم جیهانە. ئەوەی کە بڵێین: "خەڵك نابێت نەخۆش بکەون، نابێت درۆ بکەن" رێك وەك ئەوە وایە کە بڵێین: "ئەم هەتاوە تف لێکراوە بۆچی ئەوەندە گەورەیە!"

ئەسرین دەڵێت: "تا ئەوکاتەی کە لە هەموو جیهان دا ئاشتی نەبێت، من هەرگیز شاد نابم."

لەوانەیە ئەم وتەیە زۆر مرۆڤدۆستانە بنوێنێت بەڵام ئەوەندەش عاقڵانە نییە باشتروایە کە شاد بین و لەم حاڵەشدا بۆ چەسپاندنی ئاشتی لە سووچێك لە جیهاندا کە تێیدا ژیان دەکەین، هەوڵ بدەین.

ئەم مەجالە بۆ هەموومان بوونی هەیە کە دنیا هەربەوجۆرەی کەهەیە قبوڵ بکەین و ئەوکات بۆ چاکتر کردنی، بەشێك لە بەرپرسیارێتیەکە لەئەستۆ بگرینن.

## ئەگەر ئەم مەسەلەش چارەسەر دەبوو ئەوکات دەمتوانی بەتەواوەتی بەختەوەر ببم

رۆژێك بەڕێوەبەرێکی خانەنشین کراو بەمنی وت: "پێشتر نیگەرانی و دڵەڕاوکێکانم بەهۆی ملوێنەها دۆلارەوە بوو کە بەرپرسیارێتیەکەی بە من سپێردرابوو بەڵام ئێستا لەو نیگەرانیانە نەجاتم بووە خۆم بە

بابەتگەلێکی ئاسایی وەکوو پیس بوونی پەنجەرەکان و مەکینەی چیمەنبڕینەوە نیگەران دەکەم."

درووستە، ئێمە بۆ بیانووگەلێك بۆ نیگەران بوون دەگەڕێین. وایدانێن کە سەفەرێکی ئاسمانی بۆ ماوەی دوانزە کاتژمێر لەبەردەمتان دایە. تەیارە تازە هەستاوە و ئێوە هۆمێدەوارن کە لەم ماوە بەباشترین شێوە بۆ ئیستراحەت و ئەگەر بکرێت خەو، کەڵك بگرن. لەم کاتەدایە کە وڕێنە کردنی پاڵدەستیەکەتان سەرنجتان رادەکێشێت، رێك وەکوو کاتژمێرێك هەر شەش چرکە، جارێك، یەك – دوو – سێ – چوار – پێنج – خوڕ – پف – یەك – دوو – سێ – چوار – پێنج – خوڕ – پف .... لەگەڵ خۆ دەڵێن: "ئاخ نا! ئەم کابرایە مەکینەی وڕێنە کردنە! ئەگەر دەمتوانی لەدەست ئەم بەرازە رزگارم بێت ئەوکات هەموو شتێك بەویستی دڵ بەڕێوەدەچوو!" حاسیبە دەهێنن: "دە خڕ و پف لە یەك دەقیقەدا کەڕەتی دوانزە کاتژمێر، تا دەگاتە فرانکفۆرت دەکاتە حەوت هەزار و دووسەد خڕ و پف. ئەمە گەورەترین کارەستاتی ژیانی منە!"

تائەوکاتە ئاگاداری ئەو منداڵەی لە کورسی دوای ئێوەوە خەوتووە نەبوون بەڵام ئەو ئێستا بەتەواوەتی بەخەبەرە و خەریکی راهێنانی ئاوازە. منداڵانی هاروهاج لە سەفەرێکی درێژخایەندا و بەبێ وەستان! نە، بەڕاستی ناتوانی چاوپۆشی بکەی. سەیری من کە لە خوڕ خوڕی ئەم بەرازە نیگەران بووم. من دەتوانم هەموو شتێك تەحەمول بکەم جیا لە منداڵانی هاروهاج. سەیرنییە کە من ئەوەندە نیگەران و خەمۆکم!"

چوونەتە قووڵایی ئەم بیرکردنەوانەوە کە بارودۆخ، تێکدەچێت. بەبێ هیچ ئاگاداریەك لە لایەن فەرمانبەرانی تەیارەکەوە، لەناکاو تەیارە بەتوندی دەجووڵێت و رووله زەوی رێگا دەگۆڕێت. بەتەواوی هەست بە

گۆڕینی رەنگی روخسارتان دەکەن، هەموو موسافیرەکان هاوار دەکەن. لە حاڵێکدا بەدووی جلیقەی نەجاتدا دەگەڕێن لەگەڵ خوا پەیمان دەکەن: "خوایە ئەگەر رزگارم بکەی ئەدی هیچ کات گلەیی لە خوڕ و پفی ئەم بێچارە ناکەم و بەوپەڕی مەیلەوە تا خودی ئەوروپا لە دەنگی ئەم منداڵە هاروهاجانە رەنج دەبەم."

فرۆکەوان جارێکی تر کونترۆڵی تەیارەکە دەگرێتە دەست، دەگەڕێتەوە سەر بەرزایی یەکەمجار و بەهۆی ئەم خلەلە کتوپڕیەوە داوای لێبوردن دەکات. گریانی منداڵەکە کۆتایی دێت و هاوسێی بەرازەکە دەخەوێت و ئێوە لەوپەڕ ئارامی دا شیکار کردنی وشەیەی یەکتربڕ دەستپێدەکەنەوە و وائەزانن ئێستا چی رووئەدات؟ خڕ و پفی بەرازەکە دەست پێ دەکاتەوە: " ئەگەر دەمتوانی لەدەست ئەم بەرازە رزگارم بێت ئەوکات هەموو شتێك بەویستی دڵ بەڕێوەدەچوو!"

ئەمە، شێوازی ژیانە. ئێمە بۆ نیگەرانیەکانی خۆمان، پلەبەندیمان هەیە. کاتێك قاچمان شکابێت گرنگی بە سەرئێشە نادەین. وڕێنەی هاوسەرەکەمان لەوانەیە تووڕەمان بکات بەڵام ئەگەر ژووری نووستن ئاور بگرێت ئەدی کێ بیر لە وڕێنە دەکاتەوە؟ باشە ئێستا بزانین کە چۆن دەتوانین ئالرژیمان کەم بکەینەوە؟ یەکەم دەبێ قبوڵی بکەین کە سەرچاوەی هەموو ئازارە و بەڵاکان یاساگەلێکی خۆدروستکراوە کە لە مێشکی ئێمەدا جێگر بوون. ئەگەر خودی ئێمە بۆ نورماڵ کردنەوە یان فڕێدانی ئەم یاساگەلە هەنگاوهەڵگرین ئەو کاتە لە بێ بایەخی دنیای واقیعی بەرامبەر بە یاساکانمان دڵنیگەران نابین.

ئێمە دەتوانین ئەم بڕیارە هوشیارانە دابنێین: "هیچکەس ناتوانێت رۆژەکەی من تێك بدات." بەڵێن بەخۆ بدەین: "نە فەرمانبەری

لەخۆڕازی بانک، نە پۆلیسی هاتوچۆ، نە شاگردی بێ ئەدەبی ریستوارنت و نە هیچ کەسێکی دی ناتوانێت ڕۆژەکەی من تێک بدات."

ئێمە وەبیرخۆ دێنینەوە کە لە پێوانەکردنی ڕووداوەکانی ئەم جیهانە پڕ کارەساتەدا، تووش بوونی فەرمانبەرێکی بێ ئەدەب، مەسەلەیەکی بەتەواوی سادە و ئاساییە.

## کورتەی وتە

ڕێگاگەلێکی جیاواز بۆ تووڕە بوون هەیە. بۆ چێژبردن و سەرگەرمیش، ڕێگاگەلێکی جیاواز لەبەردەم ئێمە دایە. ئەگەر بۆ شاد ژیان کردن بەدووی ڕێگایەك دان یاسای کەمتر بۆخۆتان دابنێن و بێ هۆ، ژیانی خۆتان بە دەبێت و نابێتی خۆدروستکراوەوە ئاڵۆز مەکەن.

## بۆچی دەبێ فێری کونترۆڵ کردنی بیرکردنەوەکان ببم؟

بە دوو هۆکار:

١-ئێوە ناتوانن لەسەر چواردەوری خۆتان، لەسەر بارودۆخی جەوی و یان لەسەر ئەو باوەڕانەی کە خەڵکی بەرامبەر ئێوە هەیانە کۆنترۆڵتان هەبێت. گرنگترین و تەنها شتێك کە دەتوانن بەتەواوی بەسەریدا زاڵ بن فیکر و بیرکردنەوەکانی خودی خۆتانە.

٢- ئەوەی دەبێتە هۆی خۆشی و شایی مرۆڤ، دەروونی ئەوە و نەوەك هۆکارەکانی دەرەوە!

من دەڵێم: "ئەگەر ×م هەبێت، دەمتوانی بەختەوەر بم!" بەڵام هەڵەیە. تەنانەت ئەگەر ×یش بەدەست بهێنم هێشتا بیست وچوار کاتژمێر تێنەپەڕیوە کە ئاوات بۆ + دێتە ئاراوە....

کارەساتێکی بەئازار وەبیربهێننەوە. پێویست ناکات بۆ رابردووی دوور بگەڕێنەوە بیر لە حەوتووی پێشوو بکەنەوە، بە دزرانی پارەکەتان یان لەبیرکردنی رۆژی لەدایک بوونتان و یان هەر مەسەلەیەکی گەورە و بچووکی دیکە کە ئازاری داون و ئێستاکە ئیمان بەم دێڕە بهێنن: "ئەوەی ئێوەی ئازار داوە خودی کارەساتەکە نییە بیرکردنەوەی ئێوەیە سەبارەت بەو کارەساتە." لەوانەیە بڵێن: "هەرکەسی دیکەش لەجێی من دەبوو هەر ئەم هەستەی دەبوو." هەڵەیە! باشتر وایە بڵێن زۆربەی مرۆڤەکان هەر ئەم هەستەیان دەبوو. ئێمە لە ماوەی هەموو تەمەنماندا بەشێوەیەک بەرنامەمان بۆ دادەنرێت کە لە هەر بوارێکی تایبەتدا، بیرکردنەوەی تایبەتمان هەبێت و هەر ئەم بیرکردنەوە تایبەتانەیە کە شادی و بەختەوەری ئێمە دەخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە بەڵام بەردەوام لەبیرتان بێت کە ئێمە دەتوانین بیرکردنەوەکانی خۆمان بگۆڕین.

## کورتەی وتە

لەسەر بیرکردنەوەتان کاربکەن بۆ ئەوەی چۆنیەتی ژیانتان باشتر بکەن ئەوکات هەر ئەم بیرکردنەوە نوێیانە، هەستی ئێوە دەگۆڕێت.

## ئارامی خەیاڵ

بۆچی بەدووی ئاشتی و ئارامی داین؟

زۆربـــەی مرۆڤـــەکانی پەســـەندی دەکـــەن کـــە بـــەدووی عەشـــق و خۆشەویستی زیاتر دان. بەڵام گەڕان بەدووی ئارامی خەیاڵ دا دەگرنە بەر پرسیار؟ بەڕاست بۆچی دەبێ بەدووی ئەم ئارامیەدا بین؟ چونکە عەشـق و ئـارامی خـەیاڵ دوو گەوهـەرن کـە لەیـەك دانـابڕێن. عەشـق، هەستێك یـان عاتیفەیەك نییـە. عەشق، خاوەنداریـەتی کەسێکی دیکـە نییـە. عەشق، قبـوڵ کردنـە بـە بـێ دادوەری و داوەری. ئەگـەر بـەدووی عەشق دا بن، بە ئارامی دەگەن و ئەگەر لەگەڕانن بـەدووی ئارامی دا، بـە عەشـق دەگـەن. مانـای ئـارامش، خـواردنی والیـۆم نییـە. ئـارامش واتـا هاوسەنگی.

وانـەی یەکـەم لـە هـەموو وەرزشـە رەزمیەکانـد، وانـەی هاوسـەنگیە. لـە کاراتێ دا فێرتان دەکەن کە هێز، بەستراوە بە هاوتایی و هاوسەنگیەوە. ئەگـەر لەرادەبـەدەر خرۆشـاوی بـن تـووش دەبـن. قارەمانـەکانی یـاری گـوڵفیش رازی هاوسـەنگی دەزانـن. هاوسـەنگی یـان ئـارامی خـەیاڵ، چاوگە و سەرچاوەی هێزە. مرۆڤی ئارام بەمانای مرۆڤی چاك و تێکەڵ نییـە! ئـارامی بـەواتای هـاوڕا بـوون لەگـەڵ هێـز لـەجێی شـەڕ کـردن لەگەڵیان دێت. ئارامی بەمانای کراوەتر بینینی وێنەکان لەجێی گیرودە بوون لە وردەکاریەکانی دایە.

یادگـار دەڵێـت: "هـەرکات ڤیـستی ئۆتۆمۆبیلەکـەم دایـەوە ئـەوکات ئاسـوودە دەبم." ئـەم قـسەیە بـەمانای تیـۆری، چـاك دەنـوێنێ بـەڵام ئەنجامـەکان، بـەزۆری ناهومێدییـە. هۆکـار ئەوەیـە کـە ئـەرکی ئێمـە لـە ژیاندا، گەڕانەوەی ڤیست یان گەورەتر کردنی حەوزی مەلە نییە. ئێمە بۆ یارمەتیـدانی یـەکتر هاتووینەتـە دنیایـەوە و بـەم هۆیەیـە کـە جیهـان نیشانەکانی ژێرەوەی لەبەر دەستمان داناوە:

١- شادترین ساتەکانی ژیان بۆ هەر مرۆڤێک، ساتی یارمەتیدانی هاوڵاتیانە.

٢- قووڵترین هەستی تەنهایی کاتێک تووشی مرۆڤ دەبێت کە ئامانجی سەرەکی ئەو لە ژیاندا، گەیشتن بە ئاسایشی تاکەکەسی خۆی بێت.

وە ئەگەر ئێوەش لەو گروپەن کە لە ژیاندا بەدووی ئاسایشی موتڵەق دان، بەهەڵە هاتوونەتە سەر زەوی. یادگار دەڵێت: "ئەگەر دەمتوانی خانوویەکی بچووک لە دەوروبەری شاردا بۆخۆم درووست بکەم و بڕێک پارەش بۆ کاتی خانەنشین بوونم وەلابنێم، هەستم بە ئاسایش دەکرد." نە یادگار، تەنها ئاسایشی واقیعی لە دەروونی خۆتەوە ریشە دەگرێت و لە دەرەوەی چوارچێوەی بوونی تۆ، ئاسایش، تەنها ئەفسانەیەکە و بەس. گەورەترین بانکەکان مایەهیچ دەبن، گەورەترین شیرکەتەکان بەهەموو دەوروبەریشیانەوە لەناو دەچن، تەیارە گەورەکان دەکەونە خوارەوە و .... لە دەروونی خۆتدا بۆ ئاسایش بگەڕێ. چۆن دەتوانین لەگەڵ بێ باوەڕی دنیا خۆ رێکخەین؟ رێگاکەی ئەمەیە: قبووڵی بکە و چێژ ببە. نیوەی چێژی ژیان لەوەدایە کە لە رووداوەکانی سبەی بێ ئاگاین. بەخۆت بەڵێن بدە: "هەر کارەساتێك روو بدات لەگەڵی خۆ دەگونجێنم. بەرامبەر هەموو ترسەکانم دەوەستم. ئەگەر خانووەکەم بسووتێت دەگوێزمەوە. ئەگەر دەربکرێم دەست لەکار دەکێشمەوە! و ئەگەر ئۆتۆمبیل لێم بدات، دەمرم." کۆتایی چیرۆك! و ئەمە ماقیعیەتی ژیانە. زەوی، شوێنێکی مەترسیدارە زۆرێك لێرە دەمرن. بەڵام ئەمە بەمانای ئەوە نییە کە هەموو تەمەنمان وەکوو کەروێشکێکی ترساو ژیان بکەین.

## چۆن دەتوانم بەئارامی خەیاڵ بکەم؟

بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ روانگەی ئێوە و بەشێکیشی بۆ درووست کردنی خووی رۆژانەی ئارامی مێشك.

ئەگەر سەرنجتان دابێت هەموو ئەو کەسانەی کە ژیانیان لێوانلێوە لە ئارامی لە یەك خاڵدا هاوشێوەن و ئەویش ئەوەیەکە ئەم کەسانە خۆیان ئەرکدار کردووە بە پاراستنی هاوسەنگیەکی هەمیشەیی. زۆرێك لەوان لەرێگای دۆعا و پەرستنی خواوەندەوە بەم هاوسەنگیە گەیشتوون، گروپێکی دیکە روویان کردۆتە تەکنیەکانی وردبوونەوەی مێشك و .... هەموو ئەوان چۆڵی و بێدەنگی دەدۆزنەوە و بەقووڵ بوون لەخۆدایە کە سەیری دنیای دەرەوە دەکەن. خودی من، ماوەی چوار ساڵ لە پشووی کۆتایی حەوتوودا، فێرکاری تەکنیکەکانی ئاسوودە کردنی جەستە و مێشکم دەکرد و بەردەوام لە بینینی گۆڕان و پێشکەوتنی بەشداربووەکان، تووشی سەرسووڕمان دەبووم. ئەوان دەیانوت کە سەرئێشەیان نەماوە، ئیش و کەسابەتیان باشتر بووە، منداڵەکانیان بەختەوەرتر بوون، هەڵس‌وکەوتی هاوسەرەکانیان باشتر بووە و تەنانەت لە وەرزش دا پێشکەوتوون و سەیر ئەوە بوو کە لە زۆربەی ئەم خاڵانەدا، ئەوان هیچ شتێکی تایبەتیان نەکردبوو لەڕاستیدا تەنها جیاوازی ئەوان لەگەڵ رابردوویان ئەوە بوو کە وەسواسیان کەم کردبۆوە و ئەدی ژیانیان ئەوەندە جیدی نەدەگرت. لە دنیای رۆژئاوادا فێرمان دەکەن کە ئیش بکەین. من باسێکم لەسەر ئەمە نییە بەڵام بەڕای من پێش لەم چاخە دەبێ فێربین کە رۆحی دوژمنی و

رقایەتی لەگەڵ دنیادا وەلانێین. فێریان کردووین کە شەڕ بکەین، کە پەنا بۆ زۆر بەرین، کە کەسانی دیکە لەژێر گوشار نێین و هەر ئەم باوەڕە هەڵانەیە کە لە مرۆڤی رۆژئاوایی، مرۆڤێکی پەرێشان و خەمبار و سووچگیری درووست کردووە. خودی من کاتێک ئەمەم زانی کە بڕیارم دابوو کە خەریکی وێنەکێشان بم. بەڵێنم بەخۆ دابوو کە هیچ لەمپەرێك بەرم پێ نەگرێت. پێچراوەیەك کە بۆ خۆم نووسیبوو ئەمە بوو: "حەوت رۆژی حەوتوو رۆژی دە کاتژمێر ئیش بکە و ئەگەر تەواو نەبوو، شەوانەشی پێ زیاد بکە." بەمپێیە چەند تابلۆی بێ نرخم کێشا و کاتێك کە ئیتر بەتەواوەتی خەمۆك و ناهومێد بووم ئەم دێڕە لەمێشکم دا زرەنگایەوە: "هیچ ئیشێك بە ناهومێدی و تووڕەییەوە، سەرناگرێت."

ئەگەر باوەڕتان بەوە هەبێت کە ژیان، شتێك جیاواز لە مشتومڕێکی بێ کۆتایی نییە، ژیان بەڕاستی شتێك بێلەو نابێت. لاوێك بۆ چاوپێکەوتنی هونەرمەندێك بەرەو ژاپۆن بەڕێ کەوت و پاش گوێگرتن لە وتارخوێنی پرسیاری لێکرد: "من دەمەوێت ببمە گەورەترین هونەرمەندی ئەم وڵاتە. ئەم ئامانجە چەندە کاتی دەوێت؟" مامۆستا وەڵامی دایەوە: "دە ساڵ"

لاوەکە وتی: "مامۆستا! ئەگەر زۆر هوشیار بم و بەشەو و بەرۆژ هەوڵ بدەم چەندەی کات دەوێت؟"

مامۆستا وەڵامی دایەوە: "بیست ساڵ"

هەر شتێك بۆ ئامادەبوون، پێویستی بەکات هەیە.

## بێداری

ئێستا ئیتر زۆربەی خەڵك تێگەیشتوون کە ژیان کردن لە ئێستادا، چەندە دژوارە. لەڕاستی دا زۆرترین کاتی ئێمە یان بە ئاخ هەڵکێشانی رابردوو و یان بە دڵەڕاوکێی داهاتوو بەفیڕۆ دەچێت.

ژیان کردن لە ساتی هەرئێستادا وەکوو رۆیشتن لەسەر تەنافە، لە سەرەتای ئیش دا، کەوتنەوە خوارەوە، حاشاهەڵنەگرە بەڵام بە دووبارە کردنەوە و راهێنان دەتوانین فێری پاراستنی هاوتایی بین. بۆ هێشتنەوەی مێشك لە کاتی ئێستادا، پێشنیاری ئەم فەنانەی خوارەتان پێ دەکەین:

### ١- بۆ هەر ئیشێك، کاتی بێ سنوور بەخۆ بدەن

پەلە کردن لە ژیان خۆتاندا بسڕنەوە. کاتێك کە نیزامی باوەڕی ئێوە دەڵێت: "بەردەوام کاتم نامێنێت."، چاوەڕێ دەکەن چی رووبدات؟ تەئکید بن کە بەردەوام تووشی کەمی کات دەبن، بەردەوام بەدووی پاس دا رادەکەن، بەردەوام لە ئاسانسۆڕ(مەسعەدە) دوا دەکەون و بەردەوام خواردنی نیوەڕۆتان بەپەلە و لەنێوانی دوو پەیوەندی تەلەفوونی دا دەخۆن.

لەکاتی ئەنجامی دانی هەرئیشێك دا بەخۆ بڵێن: "تا کاتێك خەرکی نووسینی ئەم نامەیەم (و یان هەر ئیشێکی دیکە...) هەموو هەستم لێرەیە و هەرچەندەش کاتی بوێت. پەلەکردن، نییە."

## ٢-چاو لە هوشیاری ئاژەڵەکان بکەن

سەگەکەی خۆتان بۆ سەیران ببەن و ئەم خاڵە بەکردەوە سەیر بکەن کە سەگەکان سەرنجی هەموو شتێك ئەدەن.. هەموو گوڵەکان، هەموو درەختەکان، هەموو ئاگرکوژێنەوەکان و .... ئەگەر هەر ئەو سەگە سەدجاری دیکە هەر لەهەمان ڕێگاوە بەرنەوە بۆ ئەو هەرجارەوە ئەزموونێکی نوێیە، چونکە سەگەکان لە کاتی ئێستادا ژیان دەکەن. ئێستاکە گەڕێنەوە لای خۆتان بەتەئکید ئاگادار دەبن کە بەزۆری بیر و هۆش و هەستان لە شوێنێکی دیکەیە. هەوڵ بدەن کاتی خواردن هەست بە تامی هەموو پاروەکانتان بکەن، کاتێك لەگەڵ هاوڕێیەکی خەریکی قسەکردنن هەموو وشەکانی ببیستن، کاتێ گوێ لە گۆرانییەك دەگرن هەست بە هەموو نۆتەکانی بکەن، کاتێ پیاسە دەکەن هەموو درەختەکان ببینن. ئەگەر هەوڵ بدەن ژیان لە کاتی ئێستادا فێر دەبن. وەبیرخۆتان بهێننەوە: "من کاتێکی بێ سنوورم لەبەردەست دایە." دووپات کردنەوەی ئەم جۆرە دێڕانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ببن بە بەشێك لە زەمیری ناهوشیاری ئێمە. کاتێك هەست بە تەنگی و گوشار دەکەن بەخۆ بڵێن: "من کاتێکی بێ سنوورم لەبەردەست دایە."

سۆفی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە مرۆڤەکان لە خەون دا لەدایك دەبن، لە خەون دا ژیان دەکەن و بەرلەوەی وەخەبەر بێن لە دنیا دەڕۆن(دەمرن). بەڕای من مەبەستی ئەوان هەر هەمان بێداری و هوشیاریە کە ئێمە لێرە مەبەستمانە. لە زۆربەی کاتەکاندا بە بێ خواست خەریکی ئیشێك دەبین و خەیاڵی ئێمە لە شوێنێکی دیکە دا، بیر لە خواردنی نیوەڕۆ

دەکاتەوە. هەرچی زیاتر بتوانن لەسەر تەنافەکە خۆتان رابگرن ژیانێکی شیرینترتان دەبێت.

## بۆچی ئاسوودەیی؟

ئێمە لانیکەم لە بری هەر ئیشێك کە ئەنجامی ئەدەین چاوەڕێی بەدەستهێنانی ئەنجام و پاداشت دەکەین. بەلآم لەسەر مەسەلەی دۆعا و پەرستن، دۆخەکە جیاوازە. کەسێك کە نوێژ دەخوێنێت چاوی لە ئەنجامی کارەکە نییە. لەوانەیە بۆ سوودگەلێکی درێژماوە چاوەڕێ بن بەلآم هەموو سەرنجتان دەبێ لەسەر کاتی ئێستا چەماوە بێت. بەواتایەکی دیکە خودی کردەوە، پاداشتی خۆیەتی.

کاتێك کە تەکنیکەکانی ئاسوودەکردنی مێشك بەشێوەی بەردەوام بەکار دێنین وردە وردە ئاگادار دەبین کە هەست بەئارامی ئەو ساتە رۆحیە چۆڵ و تەنهاییانە، دزەی کردووەتە نێو ژیانی رۆژانەشمانەوە و ئێمە وردەوردە بۆ مرۆڤێکی ئارام و جوانتر بین گۆڕاوین. هەموو ئێمە دەستمان بە هاوارێکی دەروونی رادەگات بەلآم ئەم هاوارە دەروونیە، زۆر زیرەك و خێرایە و کاتێك کە ژیانمان زۆر قەرەبالغ و پڕ ورتە دەبێت ئیتر ئەم دەنگە دەرونیە بەگوێمان ناگات بەلآم کاتێك کە گوێ و چاو لە دنیای دەرەوە هەڵدەگرین ئەوکاتەیە کە دەنگی دەرونمان دەبیستین. ئەم دەنگە دەروونیە، دەنگێکی هەمیشەییە و ئێمەین کە زۆربەی کات لێی بێ ئاگاین.

لێکۆڵینەوە و تاوتوێ کردنە جۆراوجۆرەکان نیشانیان داوە کە ئاسوودەیی مێش بۆ تەندروستی جەستە، بەسوود و پێویستە. لە



Scanned by CamScanner

یەکێك لەم لێکۆڵینەوانەدا، گروپێك لە دوو زانکۆی بەناوبانگی جیهان خوێندنەوەیان لەسەر حەفتاوسێ نەفەری بەساڵاچووی دانیشتووی ماڵەوە کردووە. لێکۆڵەران تەکینکەکانی تەرکیزیان بەشێوەی هەموو ڕۆژێك بەکارهێناوە دوای تێپەڕ بوونی چوار ساڵ لە دەسپێکی لێکۆڵینەوەکەوە بینراوە کە هەموو ئەم گروپە هێشتا زیندوو بوون لەحاڵێکدا کە یەك لەسەر چواری گروپی دووهەم کە ئەم تەکنیکانەیان بەکار نەهێنانەوە مردوون.

لە ساڵی ١٩٧٨دا، رابرت کیل والاس ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی دە ساڵە کە لەسەر بەکارهێنانی تەکینەکانی تەرکیزی مێشك بوو بڵاوکردەوە، ناوبراو لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەپێی سێ فاکتەری زەختی خوێن، توانای بیستن و نزیك بینی چاو دەستی داوەتە تاقیکردنەوەی تەمەنی بیۆلۆژیکی بیسەران و بەم ئەنجامە گەیشتووە: ئەوکەسانەی بۆ ماوەی پێنج ساڵ یان کەمتر، تەکنیکەکانی تەرکیزیان بەکارهێناوە لە لایەنی بیۆلۆژیکیەوە بەشێوەی نۆرماڵ پێنج ساڵ لاوتر ماونەتەوە و ئەوانەی کە زیاتر لە پێنج ساڵ ئەم کارەیان کردووە دوانزە ساڵ لاوتر ماونەتەوە بەواتایەکی دیەك تەمەنی ناسنامەی ٦٠ ساڵان بەرامبەر بووە لەگەڵ تەمەنی بیۆلۆژیکی ٤٨ ساڵاندا.

من بە ئەزموون بەوە گەیشتووم کە هەرکات ماوەیەکم بۆ ئاسوودەیی مێشك، وردبوونەوە یان دۆعا و پەرستن تەرخان کردووە هەستم بە هاوسەنگیەکی زیاتر کردووە و باشتر بەسەر ژیاندا زاڵ بووم. بەڵام پاش وەلانانی ئەم کردەوانە، ژیان جارێکی دیکە و وردە وردە بەرەو دژواری و لەمپەر ڕۆیشتووە و من هەستم بە خەمۆکی و بێزاری کردووە. لەسەخۆبوونم لەدەست داوە و ئەوکات بە دەست پێکردنەوەی

دۆعا و پەرستن و تەکنیەکەکانی تەرکیزی مێشك ئارامیم بۆ ژیان گەڕاندۆتەوە و ئەمە دەورانێکە کە زۆرێك لە مرۆڤەکان بەردەوام لەگەڵی بەرەوڕوون. حەقیقەت ئەوەیە کە ئەگەر تاکوو ئێستا ماوەیەکمان بۆ ئاسوودەیی و خەڵوەی خۆمان تەرخان نەکردووە، ئێستا دەبێت ئەمکارە بکەین. کێشە لێرەدایە کە دوای رووکردنە ئەم تەکنیکانە و ئەنجامی پۆزەتیڤ، جارێکی دیکە بۆ سەرەتا دەگەڕێنەوە.

ئاشکراترین بەهرەی تەکینکەکانی تەرکیزی مێشك ئەوەیە کە هەستی شادی و بەختەوەری بە مرۆڤ دەبەخشێت. بەڵام ئەمە تەنها ئەنجام نییە. ئێمە بەردەوام کەسانێك بۆ لایخۆ رادەکێشین کە لە لایەنی بیرکردنەوە و هەستەوە، زۆر لەخۆمان دەچن. ئەگەر هەستی ئارامی و ئاشتیمان هەبێت مرۆڤی ئارام و هەلومەرجی ئارامتر بۆ خۆمان بەدیاری دێنین. لە روانگەی مرۆڤە تووڕەکانەوە، کەسانی ئارام و هێمن، سەیر و نائاسایی دەنوێنن و ئاساییە کە لێیان دوور دەکەونەوە تا لەشوێنێکی دیکەدا بەدووی وەکخۆیەکانیان دا بگەڕێن. ئەگەر ئێوە کەسایەتێکی ئارامتان هەبێت و ناچار بن کە لەگەڵ مرۆڤی تووڕە بەرەوڕوو ببنەوە بەزۆری ئەوان ناچار دەبن کە تایبەتمەندیەکانی ئێوە قبوڵ بکەن و هەڵسوکەوتی زۆرلەجاران باشتر پێشکەش بکەن!

بۆ فێربوونی تەکنیەکانی ئارامی و ئاسوودە کردنی مێشك، کتێب و خولی زۆر و جیاواز لەبەردەستتان دایە کە دەتوانن بە پێی کات و شوێنتان کەڵکیان لێ وەربگرن. من لێرەدا مەبەستم نییە ئەم باسە بکەمەوە و تەنها بە سێ پێشنیاری کورت بەسەندە دەکەم:

١- تەکنیەکەکانی تەرکیزی مێشك دەبێ هەموو رۆژێك و بەبێ پچڕان بەکاربهێنن. بەیانیانی زوو باشترین کاتە بۆ ئەم ئیشە

چونکە جیالەوەی ئێوە بۆ رۆژێکی چالاك ئامادە دەکات لەوکاتەشدا میشکتان بەشتی دیکەوە سەرقاڵ نییە.

٢- تەکنیکەکانی تەرکیزی مێشك بە دانیشتنەوە ئەنجام بدەن. ئەگەر رابکێشن خەوتان لێدەکەوێت.

٣- ئەگەر بۆ راهاتن کاتتان نییە، دەبێت کات پەیدا بکەن! ئەم تەکنیکانە، چەند قاتی ئەو کاتەی کەبۆی تەرخان دەکەن بۆتان دەگەڕێنێتەوە. ئەنجام دانی ئەم تەکنیکانە تەنزیم کردنی خودە، رێك وەك ئەوەی کە مەکینەی ئۆتۆمبیلەکەتان تەنزیم دەکەن. لە هەر رۆژێکدا بیست خولەك بۆ باشترکردنی کارامەیی خۆتان بۆ ئەم راهاتنانەوە تەرخان بکەن.

## بەلاًم سەبارەت بەو کەسانەی تەحەمول ناکرێن...

ئەم شێوازە تاقی بکەنەوە. هەرکاتێك کە ناچار بە قڕوبۆڵە و موناقشە دەبن و هەرکات لەگەڵ هاوسەر و بەرپرس و خزم و ... کێشەتان بۆ دروست دەبێت، خۆ لادەن. لەگەڵ خۆتان خەڵوەت بکەن. ئارامی خۆتان وەدەست بهێننەوە و ئەوکات هەوڵ بدەن کە ئەوان بە هەموو تایبەتی و کەموکورتیەکانیانەوە قبوڵ بکەن. بەهەر شێوازێك کە دەتوانن لە وێناکردنی خۆتاندا، عەشق و خۆشەویستیتان بەرامبەریان هەبێت. تەنانەت ئەگەر ئەم شێوازە، کەمێك سادە و ساکار دەنوێنێ بەلاًم تاقی بکەنەوە. هەوڵ مەدەن بە مەنتیق و سەلماندنی لێی بگەن تەنها بەکاری بهێنن. زۆرێك هەر ئەمکارە دەکەن و ئەنجامی زۆرباش بەدەست دەهێنن. لەوانەیە ئێوەش لە ئەنجامەکەی سەرسووڕماو بن.

## کورتەی وتە

هەموو ڕۆژێکتان بە مەبەستی دۆزینەوەی هاوسەنگی و وەدەستهێنانی ئارامی دەست پێ بکەن. بڕێک جار ئەم گەڕانە تەنها تا کاتی خواردنی بەیانی درێژەی دەبێت و بڕێک جاریش تا کۆتایی شەو دەبێ بۆی بگەڕێن. بەڵام لەهەر حاڵدا ئەگەر ئارامی مێشك، ئامانجی ڕۆژانەی ئێوە بێت هەر ڕۆژێك لە ڕۆژی پێشتر باشتر دەبن.

## پشوو بەخۆ بدەن!

تا ئێستا سەرنجتان داوە کە بڕێک جار ماوەی ڕۆژێک یەکسەر بەشاخەوەن و لە کۆتاییشدا بەردەوام هەست بە زیندوویی و پڕی لە وزە دەکەن و لە بڕێك کاتیشدا بە چەند کاتژمێر کڕین لە فرۆشگەیەکی گەورە ئەوەندە هەست بە ماندوویی دەکەین کە وادەزانین ئۆتۆمۆبیل لێی داوین؟

هەموو شتەکانی دەوروبەری ئێمە لەرینەوەی تایبەت بەخۆیان هەیە و ئێمە ئەم لەرینەوەیە وەردەگرین. باخ و دارستانەکان لەرینەوەی شەفابەخشیان هەیە و ئەوان وزەی لەدەست چووی ئێمە جێگۆڕ دەکەن. فرۆشگە گەورەکان و گەراجەکان لەرینەوەی جیاوازیان هەیە ئەوان وزەی ئێمە هەڵدەمژن. لەرینەوەکانی کلیسا وزەبەخشە بەڵام ریستورانتە پیسەکان و سەرمێزەکانیان وزەی ئێمە خاڵی دەکەنەوە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم حەقیقەتە کە: "هەست و تەندرووستی ئێمە، لە وزەی شاراوە و ناسکی دەوروبەری ئێمە کاریگەری دەگرێت"،

پێویست ناکات کە تواناییەکی مێشکی سەیرمان هەبێت. گومانی تێدا نییە کە کاتێک پڕوزەین لە بەرامبەر هەموو جۆرە نەخۆشی و لە بەرامبەر خەمۆکی و سووچگیری کەسانی دیکە خۆڕاگرین و کاتێک کە وزەمان لە ئاستێکی نزم دایە هەموو نەخۆشی و خەمۆکیەکان رووله خۆمان رادەکێشین.

## کورتەی وتە

سەرنج بدەن کە جەستەی خۆتان بەرەو کوێ دەبەن؟ بە برسێتی مانەوە باشترە لە خواردن لە برێك لە ریستوارنتەکان. لەماڵەوە خەوتن باشترە لە مانەوە لە ژووری برێك لە هوتێلەکان. بوێرانە خۆتان بپارێزن و باوەڕتان بە هەستی شایەتی خۆتان هەبێت. لەو شوێنانەی کە وشکتان دەکنەوە دووری بگرن. کاتێك لە مانەوەی لە شوێنێکدا هەست بە ئاسوودەیی ناکەن درێژە بە رۆیشتن بدەن!

## خەڵوەیەك بۆ خود

ئەم مەسەلە بەڕێکەوت نییە کە لە هەموو کلتوورەکانی جیهاندا، بایەخێکی تایبەتی بە خەڵوە کردن لەگەڵ خۆ ئەدەن. لە تەمەنی لاوێتی دا، سوورپێستی ئەمریکی و دەشتەوانێکی ئەفریقی پەنا بۆ لوتکەی کێو یان سێبەری دارێك لە بیاباندا دەبن تاکوو دوور لە قەرەباڵغی مرۆڤەکان، بەدووی مانای ژیاندا بگەڕێن. مامۆستا گەورەکانی مێژووی مرۆڤایەتی: محەمەد، عیسا مەسیح، بودا و هەروەها ملیۆنەها راهب و رۆحانی و سۆفی کە لەدووی ئەم گەورەپیاوانەوە هەنگاویان هەڵێناوە

هەموویان و لە خەڵوە و تەنیایی، بە میعراج گەیشتوون، هەموو کەسێك لە ئێمە پێویستی بە شوێنگەلێکی پیرۆز هەیە کە لەوێدا لە زەنگی تەلەفوون، یان لە ڕۆژنامە و کاتژمێر باسێك نەبێت، جێگایەك کە بتوانین حیسابە بانکیەکانمان لەبیر بکەین. ئەم شوێنە پیرۆزە، ئەگەر سووچێك لە نوێنەکەمان یان سەربان بێت یان دارستان، لەهەر حاڵدا شوێنێکە بۆ بیرکردنەوە و تازەگەری.

## وێنەی تەواو

کاتێك کە بە تەنها هەوڵی هەڵگرتنی شتێك ئەدەین، تێکەڵ لەگەڵ گشت جیهان پێی دەگەین.

((جان مویر))

لە سەدەی حەڤدەوە تاکوو ئێستا، زانست، ڕوانگەی نیۆتۆنی هەڵبژاردووە.

ئەم ڕوانگە بەزمانی سادە ئاوەها دەڵێت: " بۆ تێگەیشتن لە هەر شتێك، بەسەر بەشەکانیدا دابەش و ئەو بەشانە تاوتوێ بکە. ئەگەر ئەمجارەش لێ تێنەگەیشتی بە بەشی بچووکتر دابەشی بکە و ئەوەندە درێژەی پێبدە تاکوو بە خانە و ناوك و ئەلەکترۆن و کوارك و بوزون دەگەی و لەم ڕێگایەوەیە کە لەکۆتایی دا لە جیهان تێدەگەیت." بەڕاستی؟ کۆپلە شیعرێك جیابکەنەوە و بەسەر چاوگ و ئاوەڵناو و ... دابەشی بکەن دواتر ئەم وشانە پیت پیت بکەنەوە. لەم شیعرە زیاتر چیتان دەست دەکەوێت؟ تابلۆی مۆنالیزا بە بەشە پێکهێنەرەکانی دابەش بکەن چی دەدۆزنەوە؟

زانست، خزمەتگەلێکی زۆرباشی بە مرۆڤ کردووە بەڵام ئەمە لایەنێکی مەسەلەکەیە. زانست شیکار دەکات، زانست وردکاری دەکات بەڵام ئیشی دڵ، پەیوەندی دانە. پرسیارگەلێك هەن کە زانست و مەنتیق، وەڵامی بۆیان نییە. کاتێك بەوردی هاوڕێیەك شی دەکەنەوە ئیتر جوانیەکانی بوونی ئەو نابینن. کاتێك خەریکی شیکاری و لێکدانەوە و دابەش کردنی جیهان دەبن خۆتان لێ جیادەکەنەوە بەڵام کاتێك کە خۆمان لەجێگای کەسانی دیکە دادەنێین دیمەنێکی گەورەتر دەبینین و هەست بە نزیکی زیاتر دەکەین لەبەر ئەوەی بەردەوام، لەگەڵ خەڵکی پەیوەندیمان هەبێت دەبێ سەرنج و هەستیاری زیاتر لەخۆ نیشان بدەین. لەم کاکێشانەدا هەموو شتێك بەیەکترەوە بەستراوەتەوە. هەرچی زیاتر لەبیری وردکردنەوەی ئەم گشتەدا بین زیاتر لە راستیەکان دوور دەکەوینەوە.

## کورتەی وتە

وشەی بەرامبەری شیکردنەوە، تێکەڵ کردنە. تەندرووستی مرۆڤ لە بری ئەوەدایە کە بۆ هەموو شتێکی ئەم جیهانە لە گشت و تێکەڵکردن دا بگەڕێت.

## سوپاسگوزاری و ئارامی مێشك

ئەگەر لە هەموو ژیانتاندا تەنها یەك وشەی سوپاس "سوپاسگوزارم" تان بەکارهێنابێت هەر ئەو وشەیە بەسە.

((مایستر ئیکهارت))

بۆ ساتێك هەموو دادوەریەكان سەبارەت بە ژیان و دانیشتوانی جیهان بخەنە بەرپرسیار. وێنای بكەن كە سبەی لەخەو هەڵدەستن، روو لە خوای خۆ دەكەن و دەڵێن: "خوایە لەبەر ژیانم، بنەماڵەم، ماڵم، هاورێكانم، خواردنی بەیانیم و لەبەر ئەم رۆژە نوێیە سوپاسگوزاری تۆم" ئایا هەست بە ئارامی زیاتر ناكەن؟ دەزانم كە ئێستا زۆرێك دەڵێن: "بەلأم خۆتۆ بنەماڵەی منت نەبینیوە یان..." وێنای بكەن كە بەهەموو ئەم لێكدانەوانەوە بتوانن سبەی و رۆژەكانی تریش هەر بەمشێوەیە سوپاسگوزار بن ئایا ئاسوودەیی و ئارامی زیاتر بەدەست ناهێنن؟

لە ماوەی ساڵەكانی گەشە كردن دا روولە زۆربەی مرۆڤەكان دەڵێن كە ئێوە چاك و نایاب نین و زۆر زوو ئەم بەگوێدادانە قبولْ دەكەین و واهەست دەكەین لە ژیانی ئێمەدا هیچ شتێك لەرادەی شیاودا نییە نە بنەماڵە، نە هاورێ، نە ئیش و نە هیچ شتێكی دیكەش. ئاخ هەڵكێشان هەرلەوێوە دەست پێدەكات: "ئەگەر لە شوێنی ئیشەكەم دا، رێزم دەبوو..." تەنها ئەگەر مارسدسێكم دەبوو... " سەیر نییە كە گەیشتن بە ئارامی مێشك تا ئەم رادەیە دوورە لە دەست پێراگەیشتن!

شوكرانەبژێری دەبێتە هۆی ئارامی زیاتری مرۆڤ. هەرجار كە دەڵێن: "سوپاسگوزارم" لە راستیدا وەبیردەهێنیەوە كە "ئەوەی كە هەمە قبولْ دەكەم و ئەوەشی كە دەبێ فێربم، فێردەبم." سەرچاوەی ئارامی مێشك، تەركیز كردنە لەسەر ئەو نیعمەتانەی كە بەسوودین لێیان و نەوەكوو ئەوانەی كە پێمان نەدراوە. ژیان قبولْ بكەن تاكوو بزانن كە چۆن هەموو شتێكی لەخزمەتی ئێوە دایە.

## کورتەی وتە

ئەگەر بەڕاستی بەدووی ئارامی مێشك دان دەبێ هەستی سوپاسگوزاریتان هەبێت. و خاڵی سەرەکی ئەمەیە: "ئەگەر دەتانەوێت شوکرانەبژێر بن، هەموو ڕۆژێك بە شوکرانەبژێریەوە لەخەو هەستن." ئەگەر باوەڕتان ئاوەها بێت کە: "کاتێك بارودۆخی ژیانم باشتر بوو ئەوکات شوکرانەبژێر دەبم" تەئکید بن کە هیچ کات ئاوەها نابن!

## ئەی لەکۆتاییدا چی؟

لە هەر کتێبێکدا کە باس لە مانای ژیان دەکات جێی خۆیەتی کە ئاماژەش بە مردن بکرێت. ئایا ئەگەر مردنێك بوونی نەدەبوو ژیان دادوەرانەتر نەبوو؟ ئەوکات دەمتوانی لە هەڵەکانمان دەرسێك وەربگرن بەڵام مردن پێش بەوە دەگرێت کە هەموو زانیاریە تازەپێگەیشتووەکان بەکاربهێنین. بۆ نموونە: "ئێمە تەنها کاتێك لە مەترسی ئۆتۆمبیل دەگەین کە جارێك تووشی تەسادوف بووبێتین بەڵام کاتێك کە مردووین ئەدی چۆن دەبێ لەم ئەزموونە دەرس وەربگرین؟ چەندە ئارامی دەبەخشی ئەگەر تەئکیدیان دەکردینەوە کە لانیکەم تاکوو حەفتاوپێنجساڵی، هیچ هەواڵێك لە مردن نییە.

وتەی ئالبرت ئنشتەین لەمبارەوە ئارامی دەبەخشێت ئەو دەڵێت کە وزە داهێنانی نییە و لەناوچوونیش. کەوایە کاتێك کە جەستەی مرۆڤ دەمرێت ڕۆحی دەمێنێتەوە. درووستە کە پێشەکانمان دەپرتووکێن و دەبنەوە بە خاك بەڵام مرۆڤ لە مشتێك خاك زۆر سەرترە. ئەوە ڕۆحی ئەوە کە دەمێنێتەوە. کەسانێك کە لە مەرگ گەڕاونەتەوە و هەستیان بە

دەرچوونی ڕۆح کردووە وتەی لێکچوو دەگێڕنەوە. ئانت مولی دەڵێت:
"لەسەر تەختی ژووری عەمەلیات بووم و لەناکاو جەستەم بەجێهێشت چوومە سەرەوە و لەوێوە ئاگاداری عەمەلیاتی خۆم بووم جوان لەبیرم دێت کە دوکتۆرەکان چیان دەوت و لەوانەیە باوەڕ نەکەن کە ئەوان سەبارەت بە تیمی شیکاگۆ بولز قسەیان دەکرد. "مرۆڤ لە جەستەیەك زۆر سەرترە ئێستا بابزانین بەشەکەی دیکە چی بەسەر دێت؟
وتەکانی ئنشتەین و ئانت مولی مۆرکی پەسەندە لەسەر بۆچوونی مانەوەی ژیان. ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەسەر ئەمە هاوڕان. بەڵام یەك مەسەلە ئاشکرایە: کاتێك کە بەدروستی نازانین لەوبەر دەنگوباس چییە مردن دەتوانێت هاندەرێکی باش بێت بۆ چێژ بردن لە ژیان بەڕاستی سیستەمێکی زیرەکانەیە. خراپترین ڕوانگە ئەوەیە کە بڵێین:
"من لەم ژیانەدا ئازار دەکێشم بەڵام بەهەشت، ئەم ئازارانەم بۆ قەرەبوو دەکاتەوە." ئەگەری زۆری هەیە! بەڵام لەوەچاکتر ئەوەیە کە بڵێین:
"هەرجۆرێك بێت مەبەستی ئەمڕۆی من، چاك ژیان کردن لێرەدا و لە ئێستا دایە."

## کورتەی وتە

مەنتیقی دەبێت کە وایدانێین مرۆڤ هەموو توانا و تایبەتمەندیەکانی ئەم دنیایە لەگەڵ خۆ لەدنیا دەبات. کەوایە چی لەوەچاکتر کە لەم دنیایەدا بەوپەڕی هەڵگری و ڕاگری خۆ بگەین و هومێدوار بین بە گواستنەوەی هەموو سوودەکان بۆ دنیایەکی دیکە!

کەسانی دیکە وەك خۆیان
قبوڵ بکەن.

قبوڵکردنی تەواو، واتا عەشقی
بێ مەرج و چوارچێوە

# بەشی نۆهەم

بۆچی هاتووینەتە دنیاوە؟

لێبوردن

بنەماڵە

عەشق و ترس

## بۆچی هاتووینەتە دنیاوە؟

وایدانێن لە کێبەرکێ دا بەشداریتان کردووە و لەوێدا داوایان لێکردوون کە لە چەند وشەدا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە: "ئامانجی ژیان چییە؟" چیتان دەنووسی؟ "کڕینی خانوویەکی شاهانە و پڕ کردنی لە ئەشیای بەنرخ؟" "ملیۆنێک دۆلار پاشەکەوت و رابواردنی کاتی خانەنشینی لە بەرمودا؟" "پێشکەوتن لە وەرزشی گوڵف دا؟"

هەموو کەس لە ئێمە بە جۆرێکی سەربەستی دەزانین کە ژیان بایەخی لەم شتانە بەرزترە. هەرچی بێت مێژووی مرۆڤ کۆنترە لە بی.ئم و یان پێلاوی گوچی، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە بڕێک جار هەموو سەرنجی ئێمە لەسەر وردەکاریەکانە. بابەتی سەرەکی زۆربەی زۆری هەموو گۆرانی و فلیمەکان یەک شتە: سەرنج و بایەخ دان بە مرۆڤەکانی تر.

بەڵام لە دنیای راستی دا دەبێ ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بین تاکوو کارەساتێکی دڵتەزێن رووبدات و سەرنجمان بۆلای خەڵکی راکێشێت.
ماریان ویلیامسون بەجوانی باسی لەم خاڵە کردووە. ئەو بە ئاماژە بەو کەسانەی کە لە دوایین ساتەکانی ژیان دا پرسیار دەکات: ئایا قەت بیستووتانە کە کەسێك لەم ساتانەدا بە خۆشەویستەکانی بڵێت: "خۆزگە بیست هەزار دۆلاری تریشم پەیدا کردبایە؟ " و یان ئەوەی کە: "ئاگاتان لە ئۆتۆمۆبیلەکەم بێت؟" نا! ئەوان بەزۆری ئاوەها قسەگەلێك دەکەن: "ئاگاداری منداڵەکان بن، دایکتان بپارێزن..." ئایا لە بەرامبەر ئەم پرسیارە کە "بۆچی هاتوومەتە دنیاوە" وەڵامی لەمسکراو ئەوە نییە کە بڵێین: "ئێمە هاتووینەتە دنیاوە کە خۆشویستن و عەشق فێربین.
تاقیکردنەوەگەلێك کە لە نەخۆشخانەکانی ئەمریکا لەسەر دوو گروپ لە منداڵان ئەنجام دراوە ئەنجامی سەیری هەبووە. ئەم تاقیکردنەوانە دەریخستووە کە ئەو گروپەی کە رۆژانە سێ جار و هەرجارە بۆ ماوەی دە خولەك لە باوەش گیراون و دڵنەوایی کراون بەرێژەی دوو بەرامبەری گروپی شایەت کێشیان زیادی کرووە. لە زانستی پزیشکی دا بۆ ئەم جۆرە دەرمانە، ناوێکی زانستی و درێژ هەیە بەڵام لێرەدا پێویستمان بە وشەی زانستی نییە چونکە باس لە عەشق دەکەین و حەقیقەت ئەوەیە کە : "منداڵ، بەبێ عەشق و خۆشەویستی گەشە ناکات و هەروەها تەمەندارەکانیش."
من ئەم دێڕانەم لە زۆر ژن و پیاو بیستووە کە: "تەنها شتێك کە بە هەموو تەمەنم ئاواتم بۆ خواستووە ئەوە بووە کە رۆژێك لە باوکم ببیستم کە خۆشی دەوێم و شانازیم پێوە بکات."

ئەگەر راست و راستگۆ بین دەبێ بەقەناعەتەوە بڵێین کە بەزۆری هەموو نیشێك کە لە ژیاندا ئەنجاممان داوە هەوڵێك بووە بۆ بەدەستهێنانی عەشق و خۆشەویستی زیاتر. هەموو ئەو کەسانەی لە شەقامدا لەلاتانەوە تێپەر دەبن، هەموو ئەو کەسانەی کە لە شوێنی نیش و فەرمانگەکەتان دا دەیانبینن، هەرهەموو تینوی عەشق و خۆشەویستین بەلام کەسانێك بۆ بەدەستهێنانی عەشق و خۆشەویستی کەسانی تر دەست دەدەنە کارگەلێکی سەیر و شێتانە.

بۆچی ئەمە مەسەلەیە تا ئەم رادەیە مرۆڤ نیگەران و پەرێشان دەکات؟ چونکە بۆ بەرێکردنی ژیان لە رێگای درووستدا، سەرەتا دەبێ بزانین کەبۆچی هاتووینەتە دنیاوە. ئەگەر قبوڵی ناکەن کە یەکەمین و ئەساسیترین هۆی هاتە دنیای مرۆڤ، خۆشەویستی و عەشقە هەوڵ بدەن تاکوو ئامانجی خواوەند بۆخۆتان روون بکەنەوە کە ئەمە هەنگاوێکی بەراستی بەسوودە.

بەلام ئەگەر لەگەڵ بۆچوونەکەی من هاورِا بن ئەوکات دەتوانن هەموو کردەکانی خۆتان لەسەر ئەساسی ئەم قیاسە بنرخێنن: "ئایا ئەوکارەی کە دەمەوێت ئەنجامی بدەم عەشق و خۆشەویستی زیاتر بۆ ژیانی خۆم، بنەماڵەم و هاورِێیان و هاوسێکانم وەبەردێنێت؟" بۆ خۆشویستنی کەسانی تر پێویست ناکات کە هەرجارە ماچیان بکەن. بۆ خۆشویستنی کەسانی تر پێویست ناکات کە قاپە برنجەکانتان لە نێوان برسیەکانی جیهانی سێهەمدا دابەش بکەن. بۆ خۆشویستنی کەسانی تر کەمتر لێپرسینەوە و بەزۆر قسەیان پێبکەن، کەمتر دادوەری بکەن. بهێڵن ئەوەی کە حەزیان لێیەتی لەبەری بکەن. بەوجۆرەی کە

دەیانــەوێت، ژیــان بکــەن و بــەدوور لەهــەموو رەخنــەکان هەرئــەوەبن کەدەیانەوێت، هەرئەوەی کە هەن.

## لێبوردن

"لێبــوردەیی، بڵاوکردنــەوەی بــۆنی خۆشــی بەنەوشــەیە لەســەر بــنی پیلاوێك کە پێی پیاناوە."

((مارك تواین))

مەســەلە ئاوەهایــە. ئێمــە لەمێــشکی خۆمــان دا یاســاگەلێك دائــەنێین کــە خــەڵکی دەبــێ بــەپێی ئــەو یاســایانە هەڵس‌وکــەوت بکــەن و کاتێــك کــە خــەڵکی یاساکانمان لــەژێر پــێ دەنــێن لێیــان نیگــەران دەبــین. نیگــەران بــوون لــە خــەڵکی بــەهۆی بایــەخ نــەدان بــە یاســا دەرونــی و تاکەکەســی خۆمانەوە، بێ مانا و پەسەند نەکراوە.

زۆربــەی ئێمــە بــەم بــاوەڕەوە گــەورە دەبــین کــە: "دەتــوانین بــە نــەبوردنی خــەڵکی تــەمێیان بکــەین." بەواتایــەکی تــر: "ئەگــەر مــن نــەتبورم، تــۆ نێگەران ئازار دەکێشی." بەڵام لەڕاستی دا ئەمە منم کە ئازار دەکێشم، من کە بوغزێك لە دڵم دایە، من کە خەوم لێ ناکەوێت.

جاری داهاتوو کاتێك خەریکی تۆراندنی کەسێك بوون چاوتان ببەستن و لــە هەســت و جەســتەی خۆتانــدا وردببنــەوە. ئایــا تۆرانــدنی خــەڵکی، خودی خۆتانی بێچارە و تووڕە نەکردووە؟

مرۆڤــەکان خــەریکی ئــیش خۆیــانن و زانیــاری خۆیــان هەیــە و لۆمــە و سووك کردنی ئێوەش هیچ کاریگەری نییە جیالەوەی کە ژیانی خودی ئێوە لەناو دەبات. هــەوڵی مــەدەن کەســانی تــر بگــۆڕن. ئایــا ئەگــەر لافاو

ماڵەکەتان کاول بکات دەڵێن: "هەرگیز لەلافاو خۆش نابم؟" کەوایە بۆچی لە مرۆڤەکان خۆش نابن؟ دەسەڵات و کونترۆڵی ئێمە لە سەر مرۆڤەکان زیاتر لە دەسەڵاتێك کە لە بەرامبەر لافاو و بەلاَ سروشتیەکاندا هەمانە، نییە. کردەوەی جیهان بەپێی تاوان و لۆمە نییە ئەمە وشانە دەستکردی مرۆڤەکانە. کاتێك باس لە چاوپۆشی و لێبوردەی دەکرێت یەکەمین هەنگاو بۆ جێگیر بوون لە رێگای دروستی ژیاندا، لێبوردنی دایك و باوکە. قبوڵی دەکەین کە ئەوان تەواو و بێ عەیب و کەموکورتی نەبوون بەڵام لەو سەردەمەدا، دایك و باوکی ئێوە دەستیان بەم کتێبە جۆراوجۆرانەی کە ئێستا لەسەر دەروونناسی منداڵ هەیە، رانەگەیشتووە و جیالەوەش بێجگە لە پەروەردە و بارهێنانی ئێوە لەگەڵ کێشەی دیکەش یەخەگر بوون. هەڵەکانی ئەوان، ئێستا چووەتە مێژووەوە بەڵام خۆلادانی ئێوە لە لێبوردنیان، دەنگێکی پۆزەتیڤە بۆ لەناوبردنی ژیانی خودی خۆتان.

## دەرد و ئازار بەسەر مرۆڤ دا دەسەپێنرێت بەلاّم خودی خۆی نەگبەتی هەڵدەبژێرێت

لەوانەیە پرسیار بکەن: "ئەگەر کەسێك کارێکی زۆرخراپی کرد ئەوکات چی؟ ئایا هەر دەبێ لێی ببوورم؟"
هاورێیەکم هەیە کە ناوی سندی مەك گرگورە. لە ژانویەی ١٩٨٧دا شتێکی چەکدار چووە ژوورەکەیەوە و سێ کچی لاوی کوشت. ئەم کارەساتە، سندی بردە جەحانمێك لە تووڕەیی و دەردەوە. ئەوەی

بەسەر ئەو هات بۆ هیچ کام لە ئێمە تەنانەت مەجالی وێناکردنیشی تیانەبوو.

بەتێپەڕ بوونی کات و بەیارمەتی هاوڕێیان، سندی ئەم ئەنجامە گەیشت کە تەنها ڕێگای گەڕانەوەی بۆ ژیانی ئاسایی، وازلێهێنانی تووڕەیی و بەشێوەیەك لێبوردنی بکوژە. ئێستاکە سندی ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ کەسانێك کە بەدووی ئارامی مێشك و گەیشتن بە قۆناخی لێبوردن و چاوپۆشین. ئەزموونەکەی سندی بە ئاشکرایی پیشانی دەدات کە تەنانەت لە نالەبارترین هەل‌ومەرجەکانیشدا دەتوانرێت، لێبوردەیی لەجێی تووڕەیی و نەفرەت دابنرێت. سندی هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیە کە وازلێهێنانی ئەم تووڕەییە لەبەر بەرژەوەندی خۆی و بەهۆی مانەوەی خۆیەوە بووە. بەباوەڕی من مرۆڤەکان لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەزموونی مەترسیداردا دوو ڕێگای جیاواز هەڵدەبژێرن، گروپی یەکەم ئەو کەسانەن کە تا هەتاهەتایە دیلی تووڕەیی و نەفرەتی خۆیان دەبن و گروپی دووهەم ئەوانەن کە بە لێبوردن و عەفو بە قووڵایی سەربەست و نەناسراو و بە قۆناخێکی نوێ لە بەزەیی و دڵسۆزی دەگەن.

بەتەئکید ئەو ڕووداوانەی کە ڕێگەخۆشکەرە بۆ ئەم گۆڕانە مەعنەویانە لە مرۆڤدا لەدەسەڵاتی خۆدا نییە و بەواتایەکی دیکە: "ئێمە هەرگیز نامانەوێت هەنگاو بنێین لە ڕێگایەك کە بۆ گۆڕانی مەعنەوی، هیچ چارەیەك بێجگە چوونەنێوی نەبێت." جەڵدەی دڵ، نەخۆشی، تەنهایی، خەمۆکی و .... لەهەر حاڵدا هەرکام لە ئێمە بەشێکمان هەیە. پاش هەر شکست و نەمانێکی گەورە لەژیاندا بەردەوام سەرەی پرسە و خەم دێت. بەڵام لە دواییدا، مەسەلە ئەوەیە کە لە کورەی کارەسات و

ئەزموون دا، سەختتر بووین یان نەرمتر؟ بۆ هەموو ئێمە لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ رووداوی زۆرسادەتر لە ئەوەی سندی ئەمجارەش هەر ئەو هەڵبژاردنە مەبەستە: "ئایا ئەمانەوێت کە ژیانمان بەرەو درووستکردنەوە بگەڕێتەوە یان نا؟"

## ئایا دەبێ بەرامبەر خۆم عەشقم هەبێت یان لانیکەم خۆمم خۆش بوێت؟

بەڵێ! ئەو کەسانەی کەخۆیان خۆش ناوێت مرۆڤ تووڕە دەکەن!
زۆرێک لەوەی کە بەرامبەر خۆیان عەشقیان هەبێت هەست بە ئاسوودەیی ناکەن بەڵام هەر ئەم کەسانە چاوەڕێی عەشق لە لایەن هاوسەرەکانیانەوە دەکەن! کەمێك سەیر نییە؟ دەڵێم: "من ناتوانم خۆم خۆش بوێت" و دواتر لە هاوسەرەکەمان تووڕە دەبین کە بۆچی خۆشمانی ناوێت؟ بێگومان بۆ هەبوونی پەیوەندی تەندرووست دەبێ خۆمان خۆش بوێت و بەرامبەر خۆ عەشقمان هەبێت. هۆکارەکەی ئاشکرایە: من چۆن دەتوانم شتێك کە نیمە بە خەڵکانی دیکەی بدەم؟ مرۆڤ تائەوکاتەی خۆی وەك خۆی قبوڵ نەکات ناتوانێت خەڵك وەك خۆیان قبوڵ بکات. کاتێك هەموو تەرکیزی ئێمە لەسەر هەڵە و تاوانەکانی خۆمان بێت دەگەڕێین بەدووی هەر ئەو هەڵە و تاوانانەش لە خەڵکدا تالەم رێگاوە باشتر ببین و کاتێك لەحاڵی خەڵك پرسیار دەکەین لەئەنجامدا ئەم هەڵە و تاوانانە دەدۆزینەوە بەڵام کێشە لێرەدایە کە بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا، بەپێزانینی هەڵەکانی خەڵکیش، بارودۆخمان باشتر نابێت. ئەگەر لەسەر هەڵەکانمان تەرکیز بهێڵینەوە

دنیاش بەردەوام سزامان دەکات. مادام خۆمان خۆش ناوێت دنیاش خۆشمانی ناوێت و دواتر؟ دەست دەکەین بە لۆمە کردنی دنیا!

## مانای خۆشویستنی خۆ چییە؟

لە سادەترین وتەدا، خۆ خۆشویستن واتا لێبوردەیی لە خۆ، واتا دانپێدانانی ئەوەی کە تا ئێستا بەباشترین شێوە کە شارەزای بووم ژیانم کردووە. ئیتر بەسە تاکەی ئەتانەوێت خۆتان وەک تاوانبارێک سەیر بکەن؟ مرۆڤ تەواو و بێ کم و کورتی تەنها لە حیکایەت دا هەیە. لەبیری بکەن ، واقیعبین بن و لەجێی پڕبوون، پێشکەوتن بکەن بە ئامانج و مەبەستی خۆتان.

لە عەیب و کەموکورتیەکانی خۆتان ببورن و تەئکید بن کە ئەم مەسەلە بە شێوەی ئۆتۆماتیک لە لایەن خەڵکیشەوە دەکرێت. خەڵکی وەکوو ئاوێنەن کە ئێمە بەخۆ نیشان ئەدەن. ئەگەر چاک سەیری ئاوێنە بکەین بەردەوام پەیامی باش و پێویست وەردەگرین. لەبیرتان بێت کە کێشەی مرۆڤ بەردەوام لەخۆیەوە ریشە دەگرێت.

ئێمە لەبەر منداڵەکانمان دەبێ خۆ قبوڵ بکەین منداڵەکان چاو لە ئێمە دەکەن. ئەگەر ژیان بە سەختی بگرن ئەوانیش ژیان بەسەختی دەگرن و ئەوکاتەیە کە ژیانی ئێوەش سەخت و تاڵ دەکەن!

## کورتەی وتە

کاتێک لەخۆ دەبورین واز لە سەرزنشتی خەڵکیش دێنین.

## هاوسێکەت خۆش بوێت

عەشق، دەرمانی دەری دوو کەسە: عاشق... و مەعشوقە.

((کارل منینگر))

بەباوەڕی من مانای "خۆشویستنی هاوسیٚ" دەتوانرێت لە سێ شتدا کورت بکرێتەوە:

*سەبارەت بەو دادوەری نەکەین.

*مۆرکی لیٚ نەدەین.

*هیچ چاوەڕوانیەکی لیٚ نەکەین.

ئەمە دەتوانێت شێوەیەکی زانستی زۆرباش بێت بۆ رزگاری ئێمە لە بیٚ هیوایی و ناهومێدی، چونکە ئەم یاسا مەعنەویە، وەکوو زۆربەی یاساکانی خواوەند، رێگاچارەی دەروونناسی زۆرباشی لەخۆگرتووە.

ئێمە بەخۆ دەڵێین: "ئەگەر تێدەگەیشتم کە بۆچی هێمن تائەم رادەیە لەخۆڕازی و لەخۆباییە، لەوانەیە بمتوانیبایە کە خۆشم بوێت" و ئەمە هەڵەیە. بۆ تێگەیشتن لە هەڵسوکەوتی هێمن سەرەتا دەبیٚ خۆشتان بوێت. لەڕاستیدا، عەشق شتێك نییە جیالە لێبوردەیی و رێك ئەمە هۆکارێکە بۆ خۆشویستنی ئاسان و جوانتر منداڵان، چونکە ئەوان بەبیٚ تاوان و پاك دەزانین.

بۆ پێشکەوتن لە هەر شتێکدا، دەبیٚ عەشق و خۆشەویستی بکەینە سەرەتایەك بۆ خۆمان چونکە لە ئەساسدا مرۆڤ توانانی نییە کە هاوکات خۆشەویستی و نەفرەتی هەبێت!

## کورتەی وتە

چۆن بەرامبەر بەخەڵکی خۆشەویستی دەکەیت؟ هەوڵ بدەن بەوجۆرەش قبوڵی بکەن. قبوڵکردنی تەواو، هەر ئەو عەشقە بێ چوارچێوە و بێ مەرجەیە.

## بنەماڵە

## بۆچی من بنەماڵەم هەیە؟

بنەماڵەکان دروست بوون بۆ ئەوەی فێری عەشقی بەمەرجمان بکەن. ئێمە دەتوانین واز لە هاوکارەکانمان بهێنین هاوڕێکانمان بەجێبهێڵین. بەڵام مەسەلەی بنەماڵە، شتێکی جیاوازە. ئێمە لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەمان تێکەڵ بووین و ئەوان کەسانێکن کە لە هەموو شتەکانی ئێمە ئاگادارن، کەسانێك کە لە هەر هەلومەرجێك دا دەبێ خۆشمان بوێن.

لە بنەماڵەدایە کە ئێمە فێردەبین کەسانی تر بەبێ لەبەرچاو گرتنی شێوە و باڵا و خزمەتگوزاریەکانی و تەنها لەبەر خۆیان خۆش بوێت. لێرەدایە کە ئێمە کەسانی ترمان بەهۆی دەروونیانەوە خۆش دەوێت. لە چیرۆکی "کەروێشکی مەخمەڵی"یش دا بەڕواڵەت ئەسپەکەش، باس لە عەشقی بێ مەرج دەکات:

"مانای حەقیقەت ئەوە نییە کە تۆ چۆن دروست کراوی مانای حەقیقەت ئەو شتەیە کە بەسەرت دێت. کاتێ منداڵێکی خۆشی

دەوێت و بەڕاستی خۆشی دەوێت ئەوکاتەیە کە تۆ بەحەقیقەت دەبیت... و ئەمە هەموو جارێك روو نادات. بۆ ئەمجۆرە بوون ماوەیەکی زۆری دەوێت. لەبەر ئەمەیە کە ئەم "حەقیقەتە" بۆ هەموو کەس روو نادات. لەئەساسدا بە تێپەڕبوونی کاتە کە تۆ بەحەقیقەت دەبیت. درووستە کە بە تێپەڕبوونی کات قژت لە دەست ئەدەیت، چاوەکانت کز دەبن و لاواز و پیر و ژاکاو دەبیت بەڵام هیچکام لەمانە بەڕاستی بایەخێکی نییە چونکە کەسێك کە بەحەقیقەت بووە ئیتر ناتوانێت ناشیرین بێت بێجگە لەبەرامبەر کەسانێك دا کە تێناگەن."

## بایەخ نەدان بە بنەماڵە

ئایا گاڵتەجاڕی نییە کە هەڵسوکەوتی ئێمە لەگەڵ ئەو کەسانەی بۆ خواردنی ئێوارە لەماڵی ئێمە داوەتن باشتر بێت لە هەڵسوکەوت لەبەرامبەر ئەندامی بنەماڵەکەمان؟ چی بۆ بێگانە ناکەین! دووڕۆژی تەواو کاتمان تەرخان دەکەین بۆ رازاندنەوەی سفەرەی ئێوارە و باشترین قاپوقاچاخەکان بەکاردێنین. باشترین خواردنە دەریاییەکان و خواردنەوە و زەڵاتە دابین دەکەین و دوای کۆتایی میوانیەکە، ئیتر هەرگیز ئەم کەسانە نابینینەوە! حەوتووی دواتر دایك و باوکمان دێن و ئەوەی لە خواردنی نیوەڕۆ ماوەتەوە دەیخۆن! سەیرە ئێمە لەگەڵ کەسانێك کە قەت نایانناسین هەڵسوکەوتی بەڕێزترمان هەیە. لەوانەیە خراپ نەبێت کە بڕێکجاریش خواردنی دەریایی بۆ دایك و باوکمان ئامادە بکەین. من تەنها لە دوایین ساڵەکانی ژیانی باوکمدا فێر بووم کە لە ئامێزی بگرم هەروەکوو زۆرێك لە باوك و کوڕەکان منیش لە نزیکەی

تەمەنی هەشت ساڵاندا ئامێزی باوکم بەجێهێشتبوو چونکە ئەمویست هەڵسوکەوتی پیاوانەم هەبێت. بیست ساڵی تەواوی خایاند تاکوو تێگەیشتم کە پیاوە حەقیقیەکانیش دەتوانن هەستی خۆیان دەربڕن.
من وەکوو نووسەرێك، جاربەجارێ وێنەکەم لە رۆژنامە و تەلەفزیۆن دا دەبینم بەڵام لەو حەقیقەتە گەیشتووم کە سەروتاری رۆژی یەکشەممە، زبڵی رۆژی دووشەممەیە. لەخۆم پرسیار دەکەم: " من بۆ ئەوکەسانەی کە بەڕاستی من دەناسن و پاڵپشتم بۆیان (واتا بنەماڵە و هاوڕێ نزیکەکانم) مانام چییە و چیم لێ تێدەگەن؟ ئایا من جێگای باوەڕ، دەتوانم پاڵپشت بم، دڵسۆز و میهرەبانم؟ ئەوەی بەڕاستی گرنگە، هەر ئەمەیە.

## پشتیوانی هاوسەرەکەتان بن

(( بۆ بەرەوپێش بردنی پەیوەندییەك دوو رێگا هەیە: یان دەبێ ئەندامی یەك گروپ بن یان لەبەرامبەر یەکتردا بوەستن))
یادگار بەپێی بەرنامە دەبێ کاتژمێر شەش لەماڵەوە بوایە و تا ئەم ساتە دوو کاتژمێر دواکەوتووە. سەیران نیگەران و خەم دایگرتووە: "هاوسەرە میهرەبانەکەم چی بەسەر هاتووە؟" دوای پانزە خولەك یادگار دێتەوە. سەیران کە تەندرووست و زیندوو دەیبینێت هات و هاوار رێدەخات و وەك ئەوە بڵێت: "تۆ کە ئەوەندە درەنگ هاتیتەوە لانیکەم بۆچی تەسادوفت نەکرد!"

یادگار هات‌وهاوار ڕێدەخات و سەیران لە ترسا کەناڵەکە دەگۆڕێت و دەتۆڕێت و بێدەنگ دەبێت. سەیران دەسنووسێك لەسەر سەرینەکەی پەیدا دەکات: "سەبەی زوو دەبێ لە فەرمانگە ئامادە بم. کاتژمێر حەوت وەخەبەرەم بێنەوە." یادگار کاتژمێر نۆونیو وەخەبەر دێت و دەسنووسێك لەسەر سەرینکەی پەیدا دەکات: "کاتژمێر حەوت هەستە!"

زۆرێك لە ژن و مێردەکان، کاتێکی بەنرخ بەفیڕۆ ئەدەن بۆ ئەوەی هاوسەرەکەیان گێژ بنوێنن. بەڵام من هاوکاری و هاوگروپی پێشنیار دەکەم. من شانازی بە هاوسەرەکەمەوە دەکەم کە هەموو ژیان خۆی بۆ یارمەتی و هاندانی من تەرخان کردووە. من بۆ نووسینی دانە دانە لاپەڕەی کتێبەکانم و ئەنجام دانی هەموو ئیشەکانم رای جولی وەردەگرم. ئەگەر پشتیوانی ئەو نەبوو من ئەمڕۆ ئەمە نەبووم. سەیرە کە بەهۆی ئەم لێکنزیك بوونەوەیەوە بەزۆری لە سەفەرەکاندا لێمان دەپرسن: "بۆ مانگی هەنگوین بۆ ئێرە هاتوون؟" و ئەمە بۆ ئێمە هاندانێکی زۆر باشە.

ئەگەر بڕیاری ژیانی هاوبەشتان داوە پشتیوانی یەکتر بن و ئەگەر ناتوان لە هاوسەرەکەتان پشتیوانی بکەن کاتی ئەوە هاتووە کە لەخۆتان بپرسن: "بۆچی درێژە بەم پەیوەندییە بدەم؟"

## عەشق و ترس

دەروونناسان لەسەر ئەو باوەڕەن کە مرۆڤ دوو دۆخی ئەساسی مێشکی هەیە: عەشق و ترس. بەباوەڕی ئەوان ترس، ڕیشەی سۆز و هەستی نگەتیڤە. ئەم تێگەیشتنە سادەیە دەتوانێت ڕێگایەی بەسوود بێت بۆ هەڵسەنگاندنی هەستەکانمان.

نەسرین دەڵێت: "هۆی تووڕە بوونی من، توندخڕییە، نەک ترس!" ئیجازە بدەن کە تاوتوێی بکەین. مێردی نەسرین، ئازاد، لەحاڵێکدا گەڕاوەتەوە بۆماڵەوە کە بۆنی ئەلکول و بۆنی ژنانەی لێدێت. نەسرین کە زۆر تووڕەیە هاتوهاوار ڕێدەخات و قاپەکان دەشکێنێت. بەڵام لەڕاستیدا نەسرین هاوار دەکات چونکە ترساوە. ئەو لە بێبایەخی مێردەکەی ترساوە. ئەو لەوە دەترسێت کە مێردەکەی لە دەست بدات ئەو لە بۆنکردنی ئەو بۆنە ژنانە ترساوە! کاتێک تووڕەین لەڕاستیدا ترساوین. دلێر نیگەرانی قیستەکانیەتی. دلێر دەڵێت: " کاتێک من نیگەرانم، واتا نیگەرانم، ئەمە پەیوەندی بە ترسەوە چییە؟ " نیگەرانی وشەی هاومانای ترسە. ئەگەر ترسێک نەبێت بۆچی دەبێ نیگەرانی شتێک بین؟ کاتێک نیگەرانین لەڕاستیدا ترساوین سەبارەت بە بەغیلی دەتوانین چی بڵێین؟ بەغیلی هەر ئەو ترسەیە. بەغیلی واتا بیر لە سەرتر بوونی کەسانی دیکە بکەینەوە و دواتر لەوە بترسین کە نەکاو ئەوانیش هەر ئەم بیرکردنەوەیان هەبێت. کاتێک بەغیلی دەبەین لەڕاستیدا ترساوین.

ئەگەر بەچاکی بگەڕێین بەردەوام لەولای تووڕە بوون و بەغیلی ونیگەرانی و خەمۆکیەکانەوە، جێ پێی ترس دیارە. ئێستا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە ناسینی مانای ترس و عەشق چ سوودێکی بۆ ئێمە هەیە؟ و وەلأم ئەوەیە کە ئەم زانیاری و ناسینە مەجالی ئەوەمان پێ دەدات کە لەگەڵ خودی ناوخودمانە راستگۆتر بین. ئێستا دەتوانین لەوەبگەین کە هۆکاری زۆرێک لە نیگەرانیەکانمان، ئەوە نەبووە کە ئێمە وامانده‌زانی.

بۆ لەناو بردنی ترسەکان، سەرەتا دەبێ دان بە بوونیاندا بنێین. تائەوکاتەی کە دەڵێین: "تۆ مرۆڤێکی بەرچاوتەنگی، چونکە بەغیلی منت بزواندووە" بەهیچ کوێ ناگەین. ئەگەر بەدووی رێگاچارە داین دەبێ سەرەتا لەخۆ بپرسین: "بۆچی کاتێ مێردەکەمە لەگەڵ غەریبەیەکی جواندا قسە دەکات، دەترسم؟" بەمشێوە رووبەڕوو بوونەوە لەڕاستیدا بەجێی ئەوەی کە هەڵەکانی ئەو بناسین، ترسەکانی خۆمان دەناسین و کاتێک کە دانمان بە ترسەکانی خۆدا نا، بەختی زاڵبوون بەسەریاندا وەدەست دێنین.

بەدان پیانانی ترسەکانمان ئەو مەجالە بۆخۆ دەڕەخسێنین کە هەستمان بۆ خۆشەویستەکانمان دووبارە بگەڕێنەوە:

((خۆشەویستم، هۆی تووڕە بوونی من ئەوەیە کە ترساوم. لەوە ترساوم کە بەهۆی کڕینی ئەو کورسی و .... سێ هەزار دۆلاریەوە ناچار بین تاکوو ساڵێک بە برسێتی بنووین.))

((کاتێ درەنگ دێیتەوە و هات‌وهاوار دەکەم ئەترسم کە شتێکت بەسەر هاتبێت. ئەگەر تۆ لەدەست بدەم دەبێ چ بکەم؟ من دەترسم.))

کاتێ دان بە ترسەکانی خۆدا دەنێنین ئیتر پێویست ناکات کە کەسانی تر بە تاوانبار بزانین. لەڕاستیدا دەڵێین: "دەمەوێت بزانی کە من ترساوم. نامەوێت بڵێم کە تۆ تاوانباری."

کاتێک بەم ئەنجام گەیشتین کە ئیتر هۆکارێك بۆ نەبوونی کەم‌وکورتی بوونی نییە لەوکاتەدا کە بەپێی ترسەکانی خۆمان هەستمان دەردەبڕین ئەوکات دەبینین کە خۆشەوستەکانمان وەلامی پۆزەتیڤ بە پێویستیەکانمان ئەدەنەوە. دان پیانانی برینپەسەندی و ترس بەسەر هەڵس‌وکەوتی ناپەسند وەکوو شکاندنی قاپ‌وقاچاخ دا زاڵ دەبێت.

هەروەها لەبیرتان بێت کە هۆکاری نیگەرانی کەسانی تریش، ئەوەی کە خۆیان بیری لێدەکەنەوە نییە. کاتێ کە هێرش دەکەنە سەرتان لەڕاستیدا ترساون. ئەگەر ترسی ئەوان لەبەرچاو بگرن هەرگیز ئەوەندە ناترسن.

لەونەیە پرسیار بکەن: "بەلاّم ئەوەی کە عەشق و ترس، دوو سۆز و هەستی سەرەکین بەم مانایە نییە کە زۆربەی مرۆڤەکانی لە ترسدا رۆژ بەسەر دەبەن؟"

بێگومان! زۆرێك لە ئێمە لە پشتی ئەم سیما شاد و قسەخۆشەوە، لە ترسدا خنکاوین. لەوە دەترسین کە گێژ یان قەڵەو بنوێنین. دەترسین کە لەکاو نیش، پارە، یان جوانی خۆمان لەدەست بدەین. لە هێرشی

دزەکان دەترسین. لە پیربوون دەترسین و لە تەنیایی و ژیان کردن و مردن. و ئەمە هۆکاری هەڵسوکەوتی شێتانەی ئێمەیە.

وە دەرمانی دەردەکەمان چییە؟ خۆشویستنمان، خۆشەویست بوون.

راسپاردەی تۆ لەژیاندا،
گۆڕانی جیهان نییە.

ئەرکی تۆ گۆڕینی خۆتە.

هەموو ڕێگاچارەکان، لە دەروونی تۆدایە

# بەشی دەیەم

## کاتێ تۆ بگۆڕدرێی....

## تۆ هەرخۆت (تەنیا) نیت

### کاتێ تۆ بگۆڕدرێی....

ئایا تاکوو ئێستا ئەم حاڵەتەتان بۆ هاتۆتەپێش کە وابزانن لە کاتی شۆفیری دا هەموو کەس ئەیەوێت لە ئۆتۆمۆبیلەکەتان بدات؟ باش بیربکەنەوە ئایا ئەم ئەزموونە لەگەڵ ئەو ڕۆژانەی کە بە تووڕەییەوە لە ماڵ چوونەتە دەرەوە پەیوەندی نەبووە؟ کاتێ بە تووڕەییەوە ڕوو لە شەقام دەکەن وادەزانن هەموو شۆفیرەکان گەلاڵەیان بۆ کوشتنی ئێوە داڕشتووە! ئایا هەر لەو ڕۆژانەی کە بە تووڕەییەوە شوێنکارتان بەجێهێشتووە، لە کۆڵان و شەقام و ... لەگەڵ خەڵك تووشی کێشە نەبوون؟ پێچەوانەی ئەم بابەتەش درووستە. وەبیرتان دێت کە لەسەردەمی عاشقی دا، دنیا چلۆن جوان دەبێت!

جیهان، ئاوێنەیەکە؟ ئەوەی لە دنیای دەروونی خۆتاندا هەستی پێدەکەن لە دنیای دەرەوەشدا بەچاو دەیبینن و ڕێك ئەمە هۆکارە بۆ ئەوەی کە هیچکەس ناتوانێت بە دەستێوەردانی دنیای دەرەوە، سامان

بە ژیانی خۆی بدات. ئەگەر هەڵسوکەوتی خەڵکی کۆڵان و شەقام، دۆستانە نییە گۆڕینی کۆڵان و شەقام هیچ دەردێک لەئێوە دەرمان ناکات! ئەگەر لە شوێنکارەکەتاندا، هیچکەس ڕێزتان لێ ناگرێت، گۆڕینی ئیش چارەسەر نییە. فێری ئێمەیان کردووە کە ئەگەر ئیشەکەمان خۆش ناوێت، بیگۆڕین. ئەگەر هاوسەرەکەمان خۆش ناوێت، بیگۆڕین. بڕێکجاریش ئەم گۆڕانە پێویستە. بەڵام ئەگەر هاوتەریبی ئەم گۆڕانکاریانە لە خودیش دا گۆڕانکاری نەکەین سەرلەنوێ ئەم چیرۆکانە دووپات دەبنەوە. فەرماندە جراڵد کاف حەوت ساڵ لە تەمەنی خۆی لە باکووری ڤیەتنام لە زیندان دا بەسەر بردووە. ئەو دەڵێت: "لە سەرەتادا بەردەوام لەخوا دەپاڕامەوە کە بارودۆخی من بگۆڕێت: خوایە! من بگەڕێنەوە بۆ پێنج خولەکی دوایی کە ئازاد بووم تاکوو بەرەو شوێنێکی دیکە بفڕم.... خوایە! ئەمریکیەکان سەرکەوتوو بکە و من لێرە ڕزگار. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، دۆعاکانی من گۆڕدرا. لە خوا پاڕامەوە کە من بکات بە مرۆڤێکی باشتر، مرۆڤێک کە جیالەوەی ڕەنجی دیلبوونەکەی قبوڵ دەکات دەرسیشی لێ وەرگرێت و سوود ببات."

سەرنج بدەنە ئەم گۆڕانە لە ڕوانگەدا. دۆعاکانی فەرماندە جرالد لە خوایە "هەل‌ومەرجی من بگۆڕە" بۆ "خوایە من بگۆڕە" شێوەی گۆڕی بوو. ئەو درکی بە مانایەکی ئەساسی و بەنرخ کردبوو و هەر لەم خاڵەوە بوو کە ئەو، سەرەڕای هەل‌ومەرجی دژواری دەرەوە، مەبەست و ئامانجگەلێکی لە ژیانی خۆیدا دۆزیبووەوە.

مرۆڤ لە هەل‌ومەرج و شوێنی جیاواز دا جێگردەبێ تاکوو لە هەرکامەیان دەرس و ئەزموونێک وەربگرێت. دۆعا و پاڕانەوە لە خوا،

بۆ گـۆڕینی هەل‌ومـەرجی دەرەوە، بـچووکترین و مانـا و نـاوەرۆکێکی نییـە. مـرۆڤ، تەنانـەت پـاش گـۆڕانی دەرەوەش، پێویـستی بـە هەل‌ومەرجی ناوەوەی خود هەیە! ئەگەر هاوسەرگیری ئەسرین تووشی تەنگەبەری و گێرەوکێشە بووە، ئەوە کە دەبێ بگۆڕدرێت بەلاّم ئەسرین دەڵێت: "خوایە! خۆزگە مێردەکەم، ئازادت دەگۆڕی بۆئەوەی من رەنگی بەختـەوەری لـە ژیانـدا هەست پێبکـەم!" هەڵەیـە! ئازاد، ئەسرین ئـازار دەدات و لەگۆڕان خۆی لائەدات. ئەسرین لە ئازاد جیا دەبێتـەوە. سـاڵی دواتـر ئەسـرین دەڵێـت: "خوایـە! چ دەبـوو ئەگـەر مێردەکـەم، کـاوەت دەگۆڕی..."

کاتێـك کـە دەڵـێین: "خوایـە! بـارودۆخی مـن بگـۆڕە تـا مـن تووشـی سەرئێشەی گـۆڕان نـەبم" لەڕاستیدا نـەبوونی زانیـاری و نەگەیشتووی خۆمان نیشان ئەدەین. داواکاری ئێمە لە خوا دەبێ بەمشێوەیە بێت: " خوایـە! گـۆڕانم بەسـەردا بهـێنێ و بیرکردنـەوەی مـن بگـۆڕە." چـونکە هەل‌ومەرجی دەرەوە تەنها کاتێك دەگۆڕدرێت کە بیرکردنەوەی ئێمـە لە بەرامبەریدا گۆڕدرابێت.

لەوانـەی ئـەم وتانـە کـەمێك ئـەمڕۆی و سـادە بنوێنێـت. وەرن بـۆ رەتکردنـەوەی ئـەم وتانـە لـە فیزیـادا بگـەڕێین. سێسەد سالّ لـەوەپێش ئنەشـتەین وتـی کـە هـەموو شـتێك حەقیقـەتێکی دیـاریکراو و نـەگۆڕی هەیە. بەلاّم لە ئەمڕۆدا بنـەمای نـەبوونی موتڵـەقی هـایزنبرگ وێنەیەکی جیاوازی پێشکەش کـردووە: "چۆنیەتی هـەر شتێك لـە بینەرێکەوە بۆ بینەرکێی دی دەگۆڕدرێت!"

مانـای ئـەم دێـرە لـە ژیـانی رۆژانـەی ئێمـەدا چییە؟ مانـای ئەوەیـە کـە زانسـتی فیزیـا مـۆرکی پەسـەندکردن لەسـەر فێرکـاری گـەورەپیاوانی

ئایینی ئێمە، دادەنێت. ئەو گەورەپیاوانەی کە دەڵێن: "جۆری بینین و روانگەی مرۆڤ، دەبێتە هۆکارێک بۆ گۆڕینی شێوەی هەلومەرجی دەرەوە." کاتێ بیرکردنەوەی خۆتان دەگۆڕن ژیانتان دەگۆڕدرێت. باشترکردنی ژیان، ئەرکی دەروونی هەر مرۆڤێکە و نابێت هیچکەس بۆ ئەم باشترکردنە چاوەڕێی کەس بکات. کاتێ تێوە دەجووڵێن دنیاش دەکەوێتە جووڵە. هەرچەندە بگۆڕدرێن کەسانی بەشدار لە چۆنیەتی ژیانتاندا بەوڕادەیە دەگۆڕدرێن و یان جێگای خۆیان بەشداری نوێ ئەدەن و رێک ئەوکاتەی کە هەوڵی فێرکردنی وانەکانی ژیان بەرامبەر بە ئێوە ئەدەن لە ئێوەش وانەکانی ژیانی خۆیان فێردەبن.

## کورتەی وتە

لە بواری پەیوەندەی کۆمەڵایەتیدا: بێخۆ هەوڵی گۆڕانی کەسانی دەوروبەر مەدەن. بێ سوودە، ئەوەی کە دەبێ ئێوە ئەنجامی بدەن، گۆڕینی خودی خۆتانە.

## پێویست ناکات دنیا بگۆڕدرێت...

ئایا رووی داوە کە ماوەی چەند حەوتوو لە نەخۆشخانە بمێننەوە؟ ئایا دوای تێپەڕاندی ئەم ماوەیە، بینین ئاسمانی شین و درەختەکان و چیمەنە سەوزەکان بۆتان بەسۆز نەبووە؟ ئایا بینینی هاوڕێیەکی کۆن پاش ساڵانێکی زۆر بێ هەواڵی، جوان و بەبیرەوەری نییە؟ لەناکاو هەست دەکەین کە ژیان بەنرختر و پڕبەرهەمتر بووە. بەڵام ئایا هۆکار ئەوەیە کە، جیهان گۆڕاوە؟ نە! شادی و زەوقی ئێمە لەبەر روانگە و

روانینی شاد و بەکەیفی ئێمەیە. پێویستی بەختەوەری، راکێشانی شتە نوێکان نییە، بەڵکوو سڕینەوەی بیرکردنەوە کۆنەکانە بیرکردنەوەگەلێك کە هیچ سوودێکیان نییە و بۆ هیچ شتێك کەڵکیان نییە.

ئەگەر هەموو هەوڵی ئێمە لە ژیاندا، دۆزینەوەی کەموکورتی خەڵکی بێت: "سەیری کە چەند قەڵەوە، چ لوتێکی هەیە، چەندە دەمی زلە و ..."، ئەنجامی ئەم بۆگەڕانە جیالە، تێکدانی ئارامی رۆح و دەروونی خۆمان نابێت. هەڵبەت لەوانەیە بە دۆزینەوەی ئەم کەموکورتیانە، وەهمێکی سەرتر لە ئێمەدا بەرامبەر بە خەڵکی درووست بێت. بەلاّم لە هەرحاڵدا پەیامێك کە بۆ مێشکی خۆ دەینێرین ئەمەیە ك: "هیچ شتێکی پۆزەتیڤ لە دنیا و دانیشتوانی دا بوونی نییە." بەلاّم کاتێك بڕیاری قبوڵکردنی بێ مەرج و چوارچێوەی خەڵکی ئەدەین هەستێکی زۆرجیاوازمان بەرامبەر بە دنیا و شوێنی خۆ لە دنیادا بەدەست دێنین: "هەستی باشی ئارامی و ئاسوودە ژیان." بەم شێوازە، ئێمە وەکوو پێشتر، بەپێی هەڵسەنگاندنە تایبەتیەکانی خۆمان هاوڕێ و دۆست هەڵدەبژێرین بەلاّم هاوکات لەگەڵ ئەمەش دا ئەوانەی کە پەسەندی ناکەین مۆرکی خراپی و نادرووستیان لێ نادەین، هەلومەرج و سەرچاوەکانی ژیان خۆمان پەسەند دەکەین بەلاّم بێجگە ئەمانە وەکوو "خراپ" یان "نادروست" هەڵناسەنگێنین. دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە مەبەستی دوایی ئێمە لە ژیاندا، ئارامی مێشك و رۆح و دەروونە و کەوایە بڕیار ئەدەین کە جۆری روانینی خۆمان بەرامبەر بە دنیا بگۆڕین.

یادگار دەڵێت: "بەڵام من لە بنەماڵەیەک بە روانگەیەکی نگەتیڤەوە گەورە بووم و لەوێدا فێریان کردووم کە هەموو هەست و مێشکم تەرکیز لەسەر خاڵە نگەتیڤەکان بکات!" زۆر چاکە. ئێمە قبوڵی دەکەین کە تۆ لە ئاوەها بنەماڵەیەکدا گەورە بوویت بەڵام جیالەوەش باوەڕمان وایە کە لە ژیاندا، قۆناخێك هەیە کە ناوی "باڵقبوونە" و ئەوە، جێگایەکە کە هەرکەس دەبێ بەرپرسیارێتی هەڵس‌وکەوت و بیرکردنەوەکانی لەئەستۆ بگرێت. ئێستا ئیتر کاتی منداڵی و دەسەڵاتی بیرکردنەوەی گەورەکان بەسەرهاتووە کەوایە ئێستا بگۆڕدرێ.

ئەگەر لە دەوروبەری خۆدا بەدووی جوانیەکاندا بگەڕێین، جوانیگەلێکی زۆرتر لە دەروونی خۆدا دەدۆزینەوە. ئێمە لە ئاوێنەی بوونی کەسانی دیکەدا، نە ئەوان، خۆمان دەبینین. لەڕاستیدا بۆچوونێك کە سەبارەت بە دنیای دەوروبەرمان هەمانە هەڵوێستی بۆچوونێکە کە سەبارەت بە خۆمان هەمانە. ئەگەر وێنەی نێو ئاوێنەکەتان خۆش ناوێت بێخۆ لۆمەی ئاوێنەکە مەکەن.

## کورتەی وتە

لە بواری چاکسازی ژیاندا: هەوڵی گۆڕانی خۆتان بدەن. تێکۆشان بۆ گۆڕینی کەسانی تر، هەوڵێکی بێ بەرهەمە.

## تۆ هەرخۆت (تەنیا) نیت!

لەگەڵ هەرکەس کە بەرەوڕوو دەبن بەردەوام بەخۆتانی بچرپێنن کە ئەم رووبەڕوو بوونە، رووبەڕوو بوونەوەیەکی پیرۆزە چونکە ئەوەجۆرەی کە

ئەو دەبینن، خۆشتان دەبینن. بەوجۆرەی کە لەگەڵ ئەو هەڵسوکەوت دەکەن، لەگەڵ خۆشتان هەڵسوکەوت دەکەن. قەت ئەمە لەبیر مەکەن چونکە لە ئەودا یان خۆتان دەدۆزنەوە یان خۆتان ون دەکەن.

((خوێندنەوەیەك لەسەر موعجیزەکان))

ئەم جیهانە تەنانەت لەوەش سەیرترە کە تاکوو ئێستا وێناتان کردووە. ئەم جیهانە ئەوەندە بەوردی و جوانی کێشراوە کە هەموومان هەموو وانە پێویستەکانی ژیان لە ئەکتەرەکانی دیکەی دیمەنی هەستی فێردەبین. گەورەپیاوانی ئایینی فێریان کردووین کە هەموومان لەڕاستیدا تەنها یەك کەسین و گەشە و ئازارەکانمان بەیەکەوە بەستراوە. بەواتایەکی دیکە ئازاری تۆ، ئازاری منە و گەشە تۆ، گەشەی من. تێگەیشتنی ئەمە وتەیە، ئەوەندە ئاسان نییە بەڵام ئایا هەرئەم وتە ئاڵۆزە، بەڵگەیەکی گونجا (شیاو) نییە بۆ ئەم راستیە کە: هەرکات ئێمە دەگۆڕدرێن لەسەر گۆڕانی کەسانی دیکەش کاریگەری دەبێت؟"

کارل یونگ ئەم دیاردەیەی بە "هاوکاتی" ناوبردووە و بەم جۆرە باسی دەکات: "هاوکاتی واتا روودانی هاوکاتی دوو رووداوی پەیوەندیدار و مانادار کە ناتوانین تایبەتمەندی هۆ و هۆداری بۆ دانێین."

قبوڵکردنی دیاردەری هاوکاتی بەومانایەیە کە یەکەم ژیانی ئێمە مەبەستی تێدایە، دووهەمیش هەر رووداو و هەرکەسێك لەم ژیانەدا ئامانجی هەیە و سێهەم ئەوەی کە ئێمە لەم ژیانەدا رۆڵی قوربانی ناگێڕین. باش بیربکەنەوە. ئەگەر بڕیار بوایە کە جیهانێك درووست بکەن ئایا مەجالی ئەوەتان بە مرۆڤەکانی نەئەدا کە خۆیان سەربخەن و بەسەرخستنی خۆیان هەلومەرجی شوێنەکەشیان سەربخەن؟ و یان

ئـەوەی کـە ئەتانویـست هـەموو مرۆڤـەکانتان لـە رۆڵـی قوربانیـەکی بەتاڵبوودا خۆدەرخەن؟

لەوانەیە بڵێن: "ئەمە کەمێك زلکردنەوەیە و موعجیزەیەك پێویستە بۆ ئەوەی شەش ملیار دانیشتووی زەوی، بەردەوام لە کاتی درووستدا، لە شوێنی درووستدا جێگر بن تاکوو وانە پێویستەکان لە یەکتریەوە فێر بن؟"

بەڵێ، منیش قبوڵی دەکەم کە بەڕاستی سەیروسەمەر دەبێت بەڵام ئایا هاوکـاری ملیارەهـا خانـەی جیـاواز لـە جەسـتەی مرۆڤـدا لەمـە سەیروسـەمەرتر نییـە؟ هەڵبـەت هۆکارگـەلێك بـۆ خـۆڕاگری و قبـوڵ نەکردنی بۆچوونی هاوکاتی و پەیوەندی ئێمە لەگەڵ گشتێك بوونی هەیـە. یـەکێك لـەو هۆکارانـە ئەوەیـە کـە کاتێـك خۆمـان لـە خـەڵکی جیادەکەینەوە بەئسانی دەتوانین ئەوان لەبەر رەشەبای لۆمـەدا دابنـێین. بـەڵام کاتێك خۆمان پەیوەندیـدار لەگەڵ ئـەوان بـزانین ئـەوکات دەبێـت بەرپرسـیارێتی زۆرتـر لەبەرامبـەر خۆمـان و کەسـانی دەوروبەریـشدا لەئەستۆ بگرین.

بـەڵام ئـەوەی سـەرنجی مـن راکێـشاوە ئەوەیـە کـە مرۆڤـە شـاد و سەرکەوتوو و بەختـەوەرەکان هـەموو ژیانیـان بـە هەڵوێـستی بەمانای کردەوەکانیـان دەزانـن و چاوەڕێ دەکـەن کـە هەلومـەرجی دەوروبـەری خۆیان لەگەڵ خواستەکانی ئەوان هاوکات بکەن. مرۆڤە کارامەکان قەت باوەڕیان بە بکەری شەنس و بەخت لە ژیاندا نییە.

# ناچاری یان خواست؟

روانگەی مەنتقی باوەڕی وایە کە: یان خودی مرۆڤ دەبێ ڕێگایەك بۆخۆی هەڵبژێرێت یان ئەوەی کە لە ڕێگایەك لەپێشتر دیاریکراودا، هەنگاو بنێت. بەڵام بەڕای من ناچاری و خواست دەتوانێت هاوکات بوونی هەبێت بەمانایە کە ئێمە بەناچار لە ڕێگایەکدا دانرابێتین و بە خواستی خۆمان، شوێنی خۆمان لەم ڕێگایەدا هەڵبژێرین. لەوانەیە نامومکین بنوێنێ بەڵام خوا بەسەر هەموو ئیشێك دا توانای هەیە. ژیانی مرۆڤە سەرکەوتووەکان لەبەرچاو بگرن ئەوان سەرکەوتوویی خۆیان لەرێگای هەوڵی بەردەوام و ماندوونەناسی خۆیانەوە بەدەست هێناوە. ئەم گەورەپیاوانە، وەکوو من و تۆ، بەناچار لە ڕێگای ژیاندا جێگر کراون لە ڕێگایەك دا کە لەهەرحاڵدا چارەیەك بێجگە تێپەڕاندنی نییە تەنها جیاوازی ئەوانە ئەوەیە کە قەت چاوەڕێ نەبوون تاکوو کەسێك بێت و لە ڕێگای ژیاندا بیانپەڕێنێتەوە.

لە پرۆسەی ناسینی یاساکانی جیهاندا، تێپەڕبوون لە قۆناخەکانی سێ لایەنەی ژێرەوە روو ئەدات:

قۆناخی یەکەم: **هیچ ئامانجێکی دیاریکراومان نییە.**

لەم قۆناخەدا، ژیان وەکوو یاری بەخت و شەنس وێنا دەکەین و بەبێ هیچ مەبەستێك لە دنیادا خولەمان دێت. ئێمە قوربانی بیرکردنەوەی خۆمانین.

قۆناخی دووهەم: **ئیش لەسەر مەبەستەکانمان دەکەین.**

لەم قۆناخەدا لە گرنگی دابینکردنی ئامانجەکانمان دەگەین و تێدەگەین کە بە بیرکردنەوە و هەوڵی ڕێكوپێك دەتوانین بە ئەنجامی زۆرچاك

بگەین جیالەوەش لە ماوەی ئەم قۆناخە دایە کە ئاگادار دەبین کە گەیشتن بە ئامانج، بەردەوام نابێتە هۆکاری بەختەوەرتر بوونی مرۆڤ.

قۆناخی سێهەم: **ئیش لەسەر خۆمان دەکەین.**

لەم قۆناخەدا بەو ئەنجامە دەگەین کە بەکارهێنانی هەموو هەوڵێك لە کاتی ئێستادا و قبوڵکردنی بێ چوارچێوە و مەرجی ژیان، گرنگی زۆری هەیە و جیهان لەبەرامبەر ئەم روانگەیەدا، پاداشتی سەرتر لە چاوەڕوانکردنمان پێ ئەدات. لەم قۆناخەدا فێردەبین کە بۆ سەرکەوتن، دەبێ هاوسەنگیەك لە نێوان ئیشی دژوار و دیاریکردنی کات دا درووست بکەین، فێردەبین کە جیالە خەمۆکی و ناهومێدی، ڕێگای دیکەش بوونی هەیە. لەگەڵ گەیشتن بە هاوسەنگی و ئارامی مێشکدا، جۆرێك هەستی خەباتویستی لەجێی پاڕانەوە و مشتومڕی بەردەوام و بێسوود لە ژیاندا جێگیردەکەین.

## لەکوێدا دەبێ بەدووی مانا و ناوەرۆکی ژیاندا بگەڕێین؟

ژیانی ئێمە بە کردەوەیەکی گەورە، مانا و ناوەرۆك بەدەست ناهێنێت. بۆ مانای ژیان دەبێت لە کۆمەڵێك کردەوەی بچووك و ورددا بگەڕێین و پەیوەندی نێوانیان بدۆزینەوە. یادگار یەك ملیۆن دۆلار پاشەکەوتی هەیە و هێشتا پەنجە لە دەم بەدووی مانای ژیاندا دەگەڕێت. ئەسرین هەموو قۆناخەکانی ژیانی بڕیوە و ئێستا بەرپرسی شیرکەتە و هێشتا لەخۆی دەپرسێت کە مانای ئەم ژیانە چییە؟ سارا پاش ساڵانێك چاوەڕوانی، بووە بە دایك بەڵام هێشتا لەناوخۆیدا خەمۆکە.

حەقیقەت ئەوەیە کە مانای راستی ژیان نە لە دۆلارەکانی یادگار، نە لە بەرپرسی ئەسرین و نە لە بەدایک بوونی سارا دایە. مانای ژیان، "لە ئێستادا ژیان کردن"ە. هیچ شتێک باشتر لە هەبوون لە ئێرە و ئێستادا نییە. ئەگەر بەدوی مانای ژیان دان هەموو سەرنجی خۆتان بۆ ساتی ئێستا تەرخان بکەن و ئەمە، هەمان جێگایە کە پاداشتەکانی خۆتان وەردەگرن.

# "کۆتایی"



Scanned by CamScanner

# عەشق چییە؟

کەسێک بە هاوسەرەکەی دەڵێت:

"من عاشقی تۆم و بەبێ تۆ ناتوانم ژیان بکەم".

بەڵام ئەمە عەشق نییە، برسیەتیە.

ئێوە ناتوانن هاوکات کەسێکتان خۆش بوێت و بێ سەبرانەش پێوستتان پێی بێت.

عاشقی واقیعی کەسێکە کە خۆشەویستەکەی ئازاد دەکات بۆ ئەوەی خۆی بێت. لە عەشق دا ناچاری نییە. عەشق واتا دانی مەجالی هەڵبژاردن بە خۆشەویست.

بۆ ئەوەی کەسێک یان شتێک بەدەست بهێنی، ئازادی بکە!



له

نرخ (3000) دینار